بڵاوکراوەکانی نێوەندی ئارام لەبواری تەکنیک زنجیرە (21)

# فۆتۆشۆپ 10



نرخ 6000 دینار

## هەنگاو بەهەنگاو بۆهەموو ئاستەکان

دەتوانیت ئەم کتێبە بەکاربهێنیت بۆ فێربوونی فۆتۆشۆپەکانی حەوت و هەشت و نۆ و دە



### لایەنە گرنگەکانی ئەم کتێبە

- چۆنێتی دابەزاندنی بەرنامەکە
- فێربوونی سەرەتاکانی فۆتۆشۆپ
- دانانی باگراوند بۆ وێنە
- چاکردنەوەی وێنەی کۆن
- رەنگ کردنی وێنەی رەش و سپی
- چۆنێتی کاری دیزاین و جۆرەکانی
- مۆدێلەکانی رەنگ کردن
- یاری کردن بەرەنگەکان
- رەنگ کردنی دیجیتاڵی
- تەکنیکەکانی وێنەکێشان







ئیبراهیم هادی

ئەکادیمی ترین کتێب بۆ فێربوونی فۆتۆشۆپ

بڵاوکراوەکانی ئێوەندی Aram لەبواری تەکنیکی زنجیرە (21)

ئەدۆبی

# فۆتۆشۆپی 10

## هەنگاو بە هەنگاو

ئەکادیمی ترین کتێب دەربارەی بەکارهێنانی فۆتۆشۆپ لە

مێژووی چاپەمەنی کوردیدا

ئەتوانیت ئەم کتێبە بەکاربێنیت بۆ فێربوونی فۆتۆشۆپەکانی 7، 8 لەگەڵ 9.

إكرام هادى



ikramkurdi.blogspot.com

# سەر چاوەکان




# فۆتۆشۆپی ( دە )

ئامادەکردنی :ئیکرام هادی

شوێنی بڵاوکردنەوە:نێوەندی ئارام

شوێنی چاپ:سلێمانی 2008

نۆبەتی چاپ:چاپی یەکەم

تیراژ:هەزاروێنە

نرخ:6000 هەزار

ژمارەکانی نێوەندی ئارام:07701918565—07501241518

**پرۆژەی ( 100 ) کتێبی بواری کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت**

**زنجیرەی (21)**

سەرپەرشتیاری پرۆژەکە:ئارامی مەلا مەمەر

لــــەنێوەنـــدی ئـــــارامەوە بڵاودەکـــــرێتەوە

لەگەڵ ئەم کتێبەدا سیدییەکی بەرنامەکەوپێویستییەکانی وەربگرە



# بابەتەکان



## پێشەکی

هەر لە نەوەدەکانەوە ئێمە وا فێربووین بڵێین ئەدۆب فۆتۆشۆپ. لە ڕاستیشدا، ووشەی ئەدۆب (adobe) ی ئینگلیزی، هەرچەندە کە بە سەیرکردن وا دیارە کە بە ئەدۆب بخوێنرێتەوە و، ئەگەر پیشانی مامۆستایەکی زمانی ئینگلیزی بدەیت ئەویش هەر بە ئەدۆب یان ئەدۆوب ئەیخوێنێتەوە، لە ڕاستیدا، ووشەی adobe بە "ئەدۆبی" ئەخوێنرێتەوە. کەواتە لەمەولا ئەبێ خۆمان ڕابێنین و بڵێین ئەدۆبی فۆتۆشۆپ.

لەم کتێبەدا ئێمە هاتووین باسی چۆنێتی کارکردن مان کردووە لە فۆتۆشۆپی 10 دا، هەر یەکێك لە بابەتەکان باسی چۆنێتی ئەنجامدانی کارێك دەکەن، بۆ نموونە کردنەوەی فایل، یان زیادکردنی ڕووناکی وێنەیەك، هتد.

ئێمە نەهاتووین یەکە بە یەکە باسی بابەتەکانی ناو مێنیو و لیستەکان بکەین، چونکە ئەمە سوودێکی بەرچاو بە خوێنەر ناگەیەنەت و هەر کتێبێکیش کە وا بێت ئەوا زیاتر لە قاموس دەچێت نەك کتێبێکی فێرکاری.

ئەتوانن خۆت و ئەم کتێبە و کۆمپیوتەرەکەت پێکەوە چەند ڕۆژێك خەریکی تاقی کردنەوە و دەستکاریکردن و تێکدانی وێنەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت بن تا فێری هونەری کارکردن دەبێت لە فۆتۆشۆپدا.

ئەگەر شتێك بە جوانی فێربوویت، کەچی دواتر لەبیرت چووەوە وەك ئەوەی هەر نەتبیستبێت، ئەوا خەفەت مەخۆ، هەمووومان شتمان لەبیر دەچێتەوە، فۆتۆشۆپیش بەرنامەیەکی زۆر فراوانە و ئەگەر بتەوێت هەمووی بزانیت ئەوا پێویستت بە قەرزکردنی مێشکێکی تر دەبێت. ئەگەر کات و تاقەتت هەبوو ئەتوانیت دووجار یان زیاتر بە هەموو کتێبەکەدا بڕۆیت بۆ جوانتر فێربوونی بابەتەکان.

مەرج نییە هەموو کتێبەکە بخوێنیتەوە. ئەتوانیت هەر کاتێك پێویستت بە هونەرێکی نوێ بوو، بابەتی تایبەت بە ئەو هونەرە بخوێنیتەوە. بۆ نموونە تۆ وێنەیەکی کۆنی ڕەش و سپیت لایە و ئەتەوێت چاککاری لەسەر ئەنجام بدەیت، لەم حاڵەتەدا ئەتوانیت تەنها بەشی تایبەت بە چاککردنی وێنەی ڕەش و سپی بخوێنیتەوە.

هەندێك جار شتێکمان چەند جارێك دووبارە کردووەتەوە، بۆ نموونە چۆنێتی بەکارهێنانی ئامرازێك یان دۆزینەوەی فیلتەرێك، دەکرێت هەندێك خوێنەر ئەمە بە پێویست نەزانێت، بەڵام لە هەمان کاتدا خوێنەری زۆرمان هەن کە سەرەتایانە لە فۆتۆشۆپدا و دووبارەکردنەوە سوودیان پێ دەبەخشێت.

بەهیوای پێگەیاندنی تۆی هونەرمەند

ئِکرام هادی

29 ی مارسی 2008

سلێمانی

# بەشی یەکەم

# دابەزاندن و ئاکتیڤ کردنی فۆتۆشۆپی10

## دابەزاندنی فۆتۆشۆپی 10

1. کاتێك کە CD ی دابەزاندنی فۆتۆشۆپی 10 دەخەیتە ناو درایڤەکەیەوە، ڕاستەوخۆ بەرنامەی دابەزاندنی فۆتۆشۆپی 10 دەکرێتەوە، ئەگەر ئەمە ڕووی دا باز بدە بۆ هەنگاوی (4). بەڵام ئەگەر هیچ ڕوونی نەدا، لە My Computer دا کلیکی ڕاست لەسەر ئایکۆنی ئەو درایڤە بکە کە CD ی دابەزاندنی فۆتۆشۆپی 10 ی تێدایە.



2. کلیك لەسەر Open بکە.



3. دەبڵ کلیك لەسەر فایلی APSCS3E.part1 بکە.




4. ویندۆکەی خوارەوە دەکرێتەوە. کلیك لەسەر دوگمەی Minimize بکە بۆ لابردنی ویندۆکە لەسەر شاشەکە، چونکە کاری ترمان بەدەستەوەیە.




5. ئێستا فۆڵدەرێکی نوێ دروست دەکەین کە دواتر ئیشمان پێی ئەبێت. لەسەر Desktop (شاشەی سەرەکی) ی کۆمپیوتەرەکەت لە شوێنێکی بەتاڵدا کلیکی ڕاست بکە.






6. **ماوسەکە لەسەر** New **بووەستێنە و کلیك لەسەر** Folder **بکە، پاشان کلیکی زیادە مەکە و پەنجە بە هیچ دوگمەیەکی کیبۆردەکەتدا مەنێ.**




7. **بنووسە** Photoshop.

8. **لەسەر تاسکبار کلیك لەسەر** WinRar self-extracting archive **بکە بۆ دووبارە کردنەوەی پرۆگرامی دابەزاندنی فۆتۆشۆپی** 10.



8. کلیك لەسەر Browse بکە بۆ دیاریکردنی شوێنێك بۆ خەزنکردنی فایلەکانی دابەزاندنی فۆتۆشۆپی 10.




9. لێرەدا کلیك لەسەر Photoshop بکە، کە ئەو فۆڵدەرەیە لە هەنگاوی (6) دا دروستمان کرد. پێویستە درایڤی :C ی کۆمپیوتەرەکەت شوێنی بەتاڵی زۆری تێدا بێت بۆ ئەوەی جێی فایلەکان بێتەوە تێیدا. ئەگەر شوێنی بەتاڵی کەمی تێدایە ئەتوانیت درایڤێکی تر هەڵبژێریت بە کلیك کردن لەسەر My Computer لە ویندۆکەی خوارەوەدا.






10.کلیك لەسەر OK بکە.




11.کلیك لەسەر Install بکە. ئەگەر فۆتۆشۆپێکی دیکە لەم کاتەدا کراوەتەوە دایبخە ئینجا کلیك لەسەر Install بکە.

12.چاوەڕێ بکە تا پرۆسەکە تەواو دەبێت.






13.کلیك لەسەر Accept بکە.




14.کلیك لەسەر Next بکە.



15.کلیك لەسەر Install بکە.




16.چاوەڕێ بکە بۆ تەواوبوونی پرۆسەکە. ئەکرێت ماوەیەکی زۆری پێ بچێت.




17.لە کۆتاییدا کلیك لەسەر Finish بکە.



## ئاکتیڤ کردنی فۆتۆشۆپی 10

1. **کلیك لەسەر دوگمەی** Start **بکە.**




2. **کلیك لەسەر** All Programs **بکە.**



3. کلیك لەسەر Adobe Photoshop CS3 بکە. پرۆگرامی فۆتۆشۆ



4. ئێستا دووبارە CD ی فۆتۆشۆپی 10 بکەرەوە وەك لە هەنگاوەکانی (1) و (2) ی بەشی یەکەمدا باس کرا.

5. دەبڵ کلیك لەسەر فۆڵدەری KEYGEN_ بکە.



6. دەبڵ کلیك لەسەر فایلی keygen بکە.




7. ویندۆکەی خوارەوە دەکرێتەوە. ژمارەکانی ناو لاکێشەکە لە شوێنێکدا بنووسە، بۆ نموونە لەسەر پارچە کاغەزێك.




8. کلیك لەسەر ئایکۆنی Adobe Photoshop CS3 بکە لە تاسکبارِدا.



9. لەم خانانەدا ئەو ژمارانە بنووسە کە لە هەنگاوی (7) دا تەماشات کردن.




10. ئەگەر ژمارەکە ڕاست بوو نیشانەی ڕاست بە ڕەنگی سەوز لە لای ڕاستی لاکێشەکانەوە پیشان دەدرێت.




11. کلیك لەسەر Next بکە.



12.**کلیك لەسەر Never Register بکە (کاتێك ئەم ویندۆیەت پیشان دەدرێت کە هێڵی ئینتەرنێت نەبێت، ئەگەر ئینتەرنێتت هەیە ئەتوانیت ئینتەرنێتەکە بکوژێنیتەوە تا کاتی تەواوبوونی ئەم هەنگاوانە بۆ ئەوەی کێشەت تووش نەبێت).**




13.**ئێستا پرۆگرامی فۆتۆشۆپی 10 دەکرێتەوە و ئامادەیە بۆ بەکارهێنان. ئێستا کارمان بە فۆڵدەری Photoshop ی سەر شاشەکە نەماوە، لەبەر ئەوە ئەتوانین بیسڕینەوە:**



# بەشی دووەم:

# فێربوونی سەرەتاکانی فۆتۆشۆ

## شاشەی سەرەتای فۆتۆشۆپ

کاتێك بۆ یەکەمجار فۆتۆشۆپ ئەکەیتەوە ئەم شتانە ئەبینیت: لە لای چەپی شاشەکەوە "تووڵبۆکس" (بۆکسی ئامرازەکان) ی فۆتۆشۆپ، لە سەرەوەی شاشەکەدا لەژێر مێنیووەکاندا "ئۆپشنز بارِ" (شریتی هەڵبژاردنەکان) ، لە لای ڕاستی شاشەکەدا ژمارەیەکی زۆر لە "پالیت" (Palette لە زمانی ئینگلیزیدا واتە ئەو بۆردەی کە وێنەکێشێك ڕەنگەکانی لەسەر تێکەڵ ئەکات). بەڵام شوێنێکی سپی بەتاڵ نابینیت کە بتوانیت تیایدا دەست بکەیت بە کارکردن. ئەمەش شتێکی سەیر نییە چونکە لە فۆتۆشۆپدا بڕێکی زۆری ئیشەکانت لەسەر ئەو وێنانە دەکەیت کە لە سەرچاوەیەکی ترەوە وەرت گرتوون. لەوانەیە ئیش لەسەر وێنەیەك بکەیت کە لە کامێراکەتەوە یان سکانەرێکەوە وەرت گرتووە. یاخود فایلێك کە لە ئینتەرنێتەوە یان لە CD ەکەوە وەرت گرتبێت.



## دەستپێکردنی وێنەیەکی نوێ

1. کلیك لەسەر دوگمەی مێنیوی File بکە.




2. لە مێنیوی File دا کلیك لەسەر New بکە.



3. دایەلۆگ بۆکسی New دەکرێتەوە، لە لاکێشەی Name دا ناوێك بۆ وێنەکەت بنووسە، یاخود دەستکاری مەکە و فۆتۆشۆپ ناوێکت بۆ لێ دەنێت.




4. لە لیستی Preset دا چەند سیستمێکی جیاواز بۆ دیاریکردنی قەبارە (بەرزی و پانی) وێنەکەت دانراون. بۆ نموونە ئەگەر International Paper هەڵبژێریت ئەوا قەبارە ناسراوەکانی A3، A4، A5 و هتد ئەتوانیت هەڵبژێریت. ئەگەر وێنەیەکەت لە بەرنامەیەکی ترەوە کۆپی کردووە، ئەوا لێرەدا ئەتوانیت Clipboard هەڵبژێریت بۆ ئەوەی قەبارەی وێنە نوێکەت بە هەمان قەبارەی ئەو وێنەیە بێت کە کۆپیت کردووە، بۆ ئەوەی بتوانیت وێنە کۆپی کراوەکە لە وێنە بەتاڵە نوێکەدا بەبێ کەم و زیادە دابنێیت.




5. لە لیستی Size دا ئەتوانیت قەبارەی وێنەکەت دیاری بکەیت، بۆ نموونە ئەگەر لە هەنگاوی (4) دا International Paper ت هەڵبژاردبێت، لێرەدا ئەتوانیت یەکێك لە جۆرە جیاوازەکانی وەك A3 یان A4 دیاری بکەیت.



6. لە حاڵەتێکدا ئەگەر بتەوێت خۆت بەرزی و پانی وێنەکە دیاری بکەیت، لەم دوو لاکێشەیەدا ئەتوانیت برەکانیان دیاری بکەیت، Width واتە پانی و Height واتە بەرزی. بەڵام پێش ئەمە تەماشای هەنگاوی (7) بکە.




7. لێرەدا ئەتوانیت یەکەی پێوانەی پانی و بەرزی دیاری بکەیت، بۆ نموونە ئەگەر لە لاکێشەکانی هەنگاوی (6) دا ژمارەیەکی وەك 100 ت داخڵ کردبێت، لێرەدا ئەتوانیت دیاری بکەیت کە ئەم ژمارەیە چییە، ئایا سانتیمەترە، ئینچە، میلیمەترە، پیکسێلە یان هتد.





8. **لە لاکێشەی Resolution دا ڕیسوڵوشنی وێنەکەت دیاری دەکەیت. ڕیسوڵوشن واتە ژمارەی پیکسێلەکان لە یەك سانتیمەتر یان ئینچ دووجادا. هەموو وێنەیەك لە کۆمپیوتەرێکدا لە هەزاران پیکسێل پێکهاتووە، هەر پیکسێلێك چوارگۆشەیەکە کە ڕەنگێکی دیاریکراو ئەنوێنێت. بۆ نموونە وێنەکەی خوارەوە وێنەی کلیلێکە کە زۆر گەورە کراوە، هەر چوارگۆشەیەك بریتییە لە پیکسێلێك.**

9. **زۆربەی ئەو وێنانەی کە تۆ لەسەر کاغەزی ملەوەن دەی بینیت ڕیسوڵوشنەکانیان لە نێوان 150 بۆ 300 ppi دایە. ppi واتە پیکسێل لەسەر ئینچ. 200 ppi واتە دووسەد پیکسێل لە یەك ئینچدا. بە زیادکردنی ڕیسوڵوشن، ڕوونی وێنەکەت زیاتر دەبێت، بەڵام قەبارەی زیاتر داگیر دەکات لەسەر هارد دیسکی کۆمپیوتەرەکەت. بۆ وێنەیەك کە تەنها بۆ تەماشاکردن لەسەر کۆمپیوتەر بێت ڕیسوڵوشنی 72 ppi بەکاربێنە، چونکە ئەمە بەرزترین ڕیسوڵوشنە کە شاشەی کۆمپیوتەر ئەتوانێت پیشانی بدات، واتە ئەگەر ڕیسوڵوشنەکە لە 72 زیاتربێت، ئەوا تۆ هەر بە 72 لەسەر کۆمپیوتەرەکەت دەیبینیت. بەڵام ئەگەر ئەتەوێت بەرگێکی کتێب دروست بکەیت، ئەوا پێویستە ڕیسوڵوشنی 300 بەکاربێنیت بۆ ئەوەی جوانترین ئەنجام بەدەست بێنیت.**




10. **لێرەدا ئەتوانیت یەکەی ڕیسوڵوشن دیاری بکەیت، دوو هەڵبژاردنت هەیە، پیکسێل لەسەر ئینچ و پیکسێل لەسەر سانتیمەتر. پیکسێل لەسەر ئینچ بەزۆری بەکاردێت (pixels/inch).**



11. لێرەدا جۆری ڕەنگی وێنەکە دیاری بکە. جۆری ڕەنگی RGB باوترین جۆرە، بەڵام هەندێك جار پێویستە جۆرێکی تر هەڵبژێریت بۆ ئەوەی لەگەڵ پرنتەرەکەتدا ئەنجامی باشتر بەدەستەوە بدات.




12. لێرەدا ئەتوانیت قووڵی bit دیاری بکەیت، کە بابەتێکی تەکنیکییە و ئەتوانیت بەبێ دەستکاریکردن بەجێی بێڵیت. بەڵام ئەگەر حەز دەکەیت زیاتر بزانیت، ئەوا ئەم ڕوونکردنەوەیە بخوێنەرەوە: قووڵی bit بڕی ئەو زانیارییە دیاری دەکات کە هەر یەکێك لە پیکسێلەکانی وێنەیەك لەخۆی دەگرێت. هەتا پیکسێلێك bit ی زیاتری هەبێت، وێنەکە ڕەنگەکانی زیاتر لە ڕاستییەوە نزیکتر دەبن. بۆ نموونە ئەگەر وێنەیەك قووڵی bit ەکەی 1 بێت، ئەوا پیکسێلەکانی وێنەکە یان ڕەش دەبن یان سپی، ئەنجامەکەش وێنەیەکی ڕەش و سپییە. وێنەیەك کە قووڵی bit ەکەی 8 بێت ئەوا پیکسێلەکانی دەتوانن دوو توان هەشت، واتە 256 ڕەنگی جیاواز بن. وێنەیەکی RGB سێ کەناڵی ڕەنگی جیاوازی هەیە، ئەگەر تۆ قووڵی bit بە 8



دابنێیت، ئەوا bit ەکانی سەر بە هەر کەناڵێك ئەتوانن 256 ڕەنگ پیشان بدەن، ئەنجامی ڕەنگەکانیش دەبێت بە 256 توان 3، کە زیاتر لە 16 ملیۆن و نیو ڕەنگ دەکات. بۆ ئیشکردن لە فۆتۆشۆپدا پێویست ناکات لەم ژمارانە تێبگەیت، تەنها ئەوە بزانە کە تا قووڵی bit زیاتر بێت، ژمارەی ڕەنگەکانت زیاتر دەبێت و وێنەکەت ڕوونتر دەبێت و زیاتر لە ڕاستییەوە نزیك دەبێت.

13.لە لاکێشەی Background Contents ئەتوانیت بابەتەکانی پشتەوەی وێنەکەت دیاری بکەیت، ئایا ئەتەوێت پشتەوەی وێنەکە، یان باکگراوندەکەی، سپی بێت White، یان ڕەنگێك بێت کە پێشتر لە فۆتۆشۆپدا هەڵتبژاردووە بۆ باکگراوندی وێنەکانت Background Color، یان بێ ڕەنگ بێت Transparent.




14.دوای دیاریکردنی هەڵبژاردنەکانت، کلیك لەسەر OK بکە بۆ دروستکردنی وێنە نوێکەت.



15. وێنە نوێکە دەکرێتەوە و ئامادەیە بۆ کارکردن. بە ناوچە سپییەکە دەوترێت کانڤاس (canvas)، واتە ئەو قوماشەی کە چوارچێوەیەکی تەختەی هەیە و وێنەکێش وێنەی لەسەر دروست دەکات)، کە ناوچەی کارکردنی تۆیە. ئەتوانیت لە فۆتۆشۆپدا چەند کانڤاسێك پێکەوە بکەیتەوە و کاریان لەسەر بکەیت.




## گۆڕینی ڕووبەری وینداوی کانڤاس




ئەتوانیت شێوازی دەرکەوتنی شوێنی کارکردنەکەت بگۆڕیت بۆ گەورەتر یان بچووکتر بۆ ئەوەی بتوانیت بە خواستی خۆت کاری تێدا بکەیت. ئەم جۆرە گۆڕینە کار ناکاتە سەر قەبارەی ڕاستەقینەی وێنەکە، واتە تەنها تۆ بەشێوەیەکی تر تەماشای وێنەکە دەکەیت و ئەگەر وێنەکە چاپ بکەیت ئەوا گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتووە.

1. کلیك لەسەر سووچی ڕاستی خوارەوەی ویندۆی کانڤاسەکە بکە و بەبێ پەنجە هەڵگرتن لەسەر کلیك ماوسەکە بجووڵێنە بەو ئاڕاستەیەی کە دەتەوێت، دەبینیت کە لەگەڵ جووڵانی ماوسەکەدا ڕووبەری ویندۆکە دەگۆڕێت.

2. کاتێك ڕووبەری کانڤاسەکە گەیشتە ئەو ڕووبەرەی کە دەتەوێت، پەنجە لەسەر کلیك هەڵبگرە.



## گۆڕینی ڕووبەری ڕاستەقینەی کانڤاس

ئەتوانیت ڕووبەری کانڤاس بگۆڕیت بۆ هەر ڕووبەرێك کە دەتەوێت، واتە بەرزی و پانی نوێ بۆ کانڤاسەکەت دیاری دەکەیت.

1. لە مێنیوی Image دا کلیك لەسەر Canvas Size بکە.






2. لێرەدا پانی Width و بەرزی Height نویٚ بۆ وێنەکەت دیاری بکە، بەڵام یەکەمجار تەماشای هەنگاوی (3) بکە.

3. لەم لیستەدا جۆری ئەو یەکەیە دیاری بکە کە ئەتەوێت بەکاری بێنیت بۆ پێوانەی پانی و بەرزی وێنەکەت.




4. چێك بۆکسی Relative ئامرازێکی زۆر بەسوودە. ئەتوانیت ڕووبەرێك دیاری بکەیت کە بۆ ڕووبەری کانڤاسەکەت زیاد بکرێت. بۆ نموونە ئەگەر بەرزی کانڤاسەکەت 100 سانتیمەتر بێت، پاشان ئیشارەت لەم چێك بۆکسە بدەیت وٚ لە لاکێشەی بەرزی Height دا بنووسیت 5، ئەوا بەرزی کانڤاسەکەت دەبێت بە 105 سانتیمەتر. ئەشتوانیت بە بەکارهێنانی ئەم ئامرازە ڕووبەری کانڤاسەکەت بچووك بکەیتەوە، تەنها ئەوەندەت لەسەر کە لە پێش 5 ەکەوە ئیشارەتێکی لێدەرکردن دابنێیت، واتە بنووسیت (5-).






5. لە بەشی Anchor دا ئەتوانیت دیاری بکەیت کە کانڤاسە کۆنەکەت لە چ شوێنێکی کانڤاسە نوێکەتدا دابنرێت، گرنگی ئەم فرمانە کاتێك دەردەکەوێت کە وێنەیەکت لەناو کانڤاسەکەدا هەبێت. سەرەتا چوارگۆشە بەتاڵەکە کە کانڤاسە کۆنەکەت دەنوێنێت لە ناوەڕاست دایە، ئەگەر کلیك لەسەر یەکێك لە سەهمەکان بکەیت ئەوا چوارگۆشە دەچێتە شوێنی سەهمەکە، واتە شوێنی چوارگۆشەکە دەگۆڕێت. کاتێك چوارگۆشەکە لە ناوەڕاستدایە، ئەوە دەگەیەنێت کە کانڤاسەکە لە هەموو لایەکەوە بۆی زیاد دەکرێت یان لێی کەم دەکرێتەوە، بەڵام ئەگەر لە سووچێکدا بێت بۆ نموونە، ئەوا واتە لە لاکانی ترەوە کانڤاسەکەی بۆ زیاد یان کەم دەکرێت.



بۆ زیاتر تێگەشتن لە ئیشی Anchor، تەماشای نموونەکەی خوارەوە بکە:




وێنە ئەسڵییەکەی وێنەکەی لای چەپە، پاشان لە وێنەکەی لای ڕاستدا کانڤاسەکەی بۆ گەورە کراوە لە لای ڕاستەوە، بەهۆی کلیك کردن لەسەر سەهمی لای چەپ لە بەشی Anchor دا، وەك لە وێنەکەی خوارەوەدا دیارە:




6. لە بەشی Canvas extension color دا ئەتوانیت ڕەنگی کانڤاسە نوێکە دیاری بکەیت. لە لیستەکەدا ئەتوانیت یەکێك لە ڕەنگەکان هەڵبژێریت. ئەتوانیت کلیك لەسەر Other بکەیت لە خوارەوەی لیستەکەدا بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگێك کە لە لیستەکەدا نەبێت.

7. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.

# ئامرازەکانی سیلێکت کردن

لە سەرەوەی توولبۆکس دا کۆمەڵێك ئامراز هەن پێیان دەوترێت ئامرازەکانی سیلێکت کردن. سیلێکت کردن واتە دیاری کردن یان هەڵبژاردن، لە فۆتۆشۆپدا واتە دیاریکردنی بەشێك لە ڕووبەری کانڤاس یان پانتایی ڕووبەری کانڤاس بۆ ئەنجامدانی کارێك لەسەری، بۆ نموونە کۆپی کردنی، یان دانانی ڕەنگێك بۆ شوێنێکی دیاری کراو. سێ جۆر ئامرازی سیلێکت کردنمان هەیە:




- ئامرازی مارکی بۆ سیلێکت کردن.
- ئامرازی لاسوو بۆ سیلێکت کردن.
- ئامرازی سیلێکت کردنی خێرا.



ڕووبەرێکی سیلێکت کراو لەسەر شاشەکە بە هۆی سنوورێکەوە دیاری دەکرێت، سنوورەکەش هێڵێکی پچڕپچڕە، ناوچە پچڕپچڕەکان دەجووڵێن بۆ ئەوەی بە ئاسانی سنوورەکە ببینیت.




ئەگەر کلیکی ڕاست بکەیت لەسەر هەر یەکێك لە سێ ئامرازەکە، مێنیویەك دەکرێتەوە کە ئامرازی زیاتری تێدایە لە هەمان جۆر.

بۆ بەکارهێنانی ئامرازەکانی مارکی و لاسوو، کلیك لەسەر ئامرازەکە بکە، پاشان کلیك لەسەر سەرەتای ڕووبەرێك بکە کە ئەتەوێت سیلێکتی بکەیت، پاشان بەبێ پەنجەهەڵگرتن لەسەر کلیك ماوسەکە ڕابکێشە بەسەر ڕووبەرەکەدا هەتا هەموو ڕووبەرەکە سیلێکت دەکەیت، جا پەنجە لەسەر کلیك هەڵبگرە.



لە وێنەکەی خوارەوەدا ئەو هێمایەی مۆسیقامان سیلێکت کردووە بە بەکارهێنانی ئامرازی مارکیی بازنەیی، سەهمەکە ڕێگای جووڵانی ماوسەکە پیشان دەدات.

ئامرازی سیلێکت کردنی خێرا (Quick Selection Tool) بەپێی ڕەنگ ڕووبەرەکان سیلێکت دەکات. گرنگی ئەم ئامرازە لەوەدایە کە بەشێوەی بڕەش (Brush، واتە فڵچە) کاردەکات.

دوو ئامرازی تر لەم کۆمەڵەیەدا بریتین لە ئامرازەکانی کرۆپ (Crop) و سلایس (Slice). ئامرازی کرۆپ بۆ بچووککردنەوەی وێنەیەك بەکاردێت بە بڕینی وێنەکە لە چوارچێوەکەیەوە، بە مانایەکی تر واتە بچووککردنەوەی کانڤاس. ئامرازی سلایس بەکاردێت بۆ دروستکردنی وێنە بۆ وێب، بەهۆیەوە ئەتوانرێت وێنەیەك بکرێت بە چەند کەرتێکەوە، بۆ ئەوەی هەر کەرتێکیان لە کاتی کلیکدا لینکێکی دیاریکراو بکاتەوە.

## ئامرازەکانی ڕەنگکردن




ئامرازەکانی ڕەنگکردن بریتین لە برەش (Brush)، پێنسڵ (Pencil، واتە قەڵەم)، لەگەڵ کلەون ستامپ (Clone Stamp، ستامپ واتە مۆر –ئەو مۆرەی بۆ مۆرکردنی لاپەڕەی کتێب یان وەصڵ بەکاردێت– کلەونیش واتە لەبەرگیراوە، شتێك کە لەبەرگیراو یان استنساخی شتێکی تر بێت). ئەم ئامرازانە شاشەکە ڕەنگ دەکەن بە ڕێگەی جیاواز. ئەتوانیت گۆشە و ئەستووری زۆربەیان بگۆڕیت. بە کلیککردنی ڕاست لەسەر ئامرازی برەش لە تووڵبۆکسەکەدا، مێنیویەك دەکرێتەوە کە سێ ئامرازی برەش و پێنسڵ و گۆڕینەوەی ڕەنگی تێدایە.

ئەم ئامرازانەوە ئامرازەکانی تر لە داهاتوودا باس دەکەین.

## ئامرازەکانی ڤیو

لە فۆتۆشۆپدا دوو ئامرازی سەرەکی ڤیو (view، واتە پیشاندان) مان هەیە: ئامرازی هاند (Hand، واتە دەست)، لەگەڵ ئامرازی زووم (Zoom، واتە نزیککردنەوە و دوورخستەوەی دیمەنێك). وێنەی ئامرازی زووم برتییە لە زەرەبینێك و وێنەی ئامرازی هاند برتییە لە دەستێك. ئامرازی زووم ڕێگەت پێ ئەدات وێنەیەك بهێنیتە پێشەوە بەهۆی کلیك کردن لەسەر کانڤاس، هەروەها ڕێگەت پێ ئەدات وێنەیەك ببیتە دواوە بەهۆی پەنجە نان بە کلیلی Alt (لەسەر کیبۆردەکەت) و کلیك کردن لەسەر کانڤاس. هەروەها ئەتوانیت ڕووبەرێکی دیاریکراو بهێنیتە پێشەوە بەهۆی کلیك کردن لەسەر سووچی سەرەتای ڕووبەرەکە و ڕاکێشانی ماوسەکە بۆ سووچەکەی بەرامبەری. زۆرجار کاتێك وێنەیەك زووم ئەکەیت، وێنەکە زۆر گەورە دەبێت و ناتوانیت هەموو بە جارێك ببینیت. ئامرازی هاند وێنەکەت بۆ دەجووڵێنێت بۆ ئەوەی بەشەکانی تری وێنەکە ببینیت.



# بەشی سێیەم:

# کردنەوە و خەزنکردنی فایل

## ئیشکردن لەگەڵ فایلەکاندا

فۆتۆشۆپ ئەتوانێت چەندین فۆرماتی جیاوازی وێنە بکاتەوە و خەزن بکات.

Flower
443 x 197
JPEG Image

فۆرمات (Format) واتە جۆری فایل. لە جیهانی ویندۆزدا فایل فۆرمات بەهۆی پاشگری ناوی فایلەکانەوە دیاری دەکرێت، بۆ نموونە فایلێك بەرنامەی ووِرد ناوەکەی کۆتایی دێت بە ".doc"، فایلێکی وێنەی Bitmap ناوەکەی کۆتایی دێت بە ".bmp". بە شێوەیەکی گشتی لە کۆمپیوتەرەکاندا پاشگری فایلەکان دەرناکەون، بۆیە فایلێکی وێنە کە ناوی Flower بێت ئەوا هەر بە Flower دەردەکەوێت:



بەڵام ئەتوانرێت پیشاندانی پاشگری فایلەکان بخرێتە کار، لەم حاڵەتەشدا ناوی فایلەکە بە Flower.jpg دەردەکەوێت:

ئەو فایل فۆرماتەی کە لە فۆتۆشۆپدا زۆرترین بەکارهێنانی هەیە بریتییە لە فایلی Photoshop Document کە پاشگرەکەی psd ە. کێشەی بەکارهێنانی ئەم فایل فۆرمات بریتییە لەوەی کە لە بەرنامەکانی تردا لەوانەیە کار نەکات. بۆیە کاتێك ئەتەوێت فایلەکەت لە بەرنامەیەکی دیکەدا بەکاربێنیت، یان پرنتی بکەیت، یان لە ئینتەرنێتدا بلاًوی بکەیتەوە، پێویستە بە فۆرماتێك خەزنی بکەیت بۆ ئەو مەبەستانە بشێت.

لە فۆتۆشۆپی 8 دا جۆرێکی نویٚ لە فۆرماتی فۆتۆشۆپ خرایە ڕوو ئەویش فۆرماتی Large Document ە، کە پاشگرەکەی بریتییە لە ".psb". مەبەست لەم فایلە بریتییە لە خەزن کردنی وێنەی زۆر گەورە، بۆ نموونە وێنەیەك کە ڕووبەرەکەی سەدان و هەزاران ئەوەندەی ڕووبەری شاشەیەکی کۆمپیوتەرە. ئەم فۆرماتە لەگەڵ بەرنامەکانی فۆتۆشۆپی 8 و دواتر کاردەکات، بەڵام لەگەڵ فۆتۆشۆپەکانی پێش 8 کار ناکات.

لە خوارەوە باسی فۆرماتە گرنگەکان دەکەین کە لە فۆتۆشۆپدا کاریان پیٚ دەکرێت، ئەوەش بزانە کە فۆتۆشۆپ چەندین فۆرماتی دەکەش کار پیٚ دەکات:

- Bitmap (.bmp) – فایلێکی وێنەی ویندۆزە کە بە گشتی قەبارەی زۆر گەورەیە. پێویستە خۆت لەم فۆرماتە بپارێزیت مەگەر بەتایبەتی پێویستت پێی بێت بۆ هەندێك بەرنامە.
- Camera Raw– بریتییە لە فۆرماتی کامێرا پێشکەوتووەکان. فایلێکی Camera Raw زانیاری ڕاستەوخۆ لە عەدەسەی کامێراکەوە وەردەگرێت، هەروەها زانیاری دەربارەی چۆنیتی گرتنی وێنەکە خەزن دەکات. لە کامێرایەکی دیجیتاڵی ئاساییدا وێنەکانت بە فۆرماتی JPEG خەزن دەکرێن. واتە کامێراکە زانیاریی لە عەدەسەکەوە وەردەگرێت، پاشان زانیارییەکە وەردەگێڕێت بۆ JPEG. بەڵام لە کامێرایەکی

Camera Raw دا کامێراکە زانیاریی لە عەدەسە و هەستەری ڕووناکی و پارچەی دیکەی کامێراکە وەردەگرێت و ڕاستەوخۆ خەزنی دەکات، واتە وەری ناگێڕێت و زانیارییەکە بە دەستکارینەکراوی دەمێنێتەوە. فۆرماتی Camera Raw وەك فیلمێکی نێگەتیڤی ناو کامێرایەکی فۆتۆگراف وایە کە خۆت دەیشۆیتەوە. ئەم فۆرماتە کۆنترۆڵی تەواوت پێ دەدات لە چۆنێتی دەرچوونی وێنەی کۆتایی. ئەم فۆرماتی بەزۆری سوودی بۆ وێنەگرە شارەزاکان هەیە.

- GIF (.gif)– یەکێکە لەو فۆرماتانەی لە ئینتەرنێتدا لە ڕابردوودا زۆر بەکاردەهات بەهۆی بچووکی قەبارەی فایلەکەیەوە (واتە کاتێکی کەمتری پێویستە بۆ دابەزین). بەڵام GIF تەنها ئەتوانێت 256 ڕەنگ پیشان بدات کە ئەنجامەکەشی بریتییە لە ڕەنگی زەق و دوور لە ڕاستی. بۆیە ئێستا فۆرماتی PNG خەریکە شوێنی دەگرێتەوە.
- JPEG (.jpg)– ئەم فۆرماتە لەم ڕۆژەدا بەناوبانگترین فۆرماتی وێنەیە بەهۆی بچووکی قەبارەکەیەوە جوانی وێنەکانی.
- PNG (.png)– فۆرماتێکی نوێیە کە بچووکی GIF و ڕەنگە زۆرەکانی JPEG لەخۆ دەگرێت.
- Raw (.raw)– ئەم فۆرماتە سوودی ئەوەیە کە لە سەر پرۆگرام و ئامێری جیاوازی زۆر کاردەکات. ئەم فۆرماتەت لەگەڵ Camera Raw دا لێ تێك نەچێت، واتە دوو فۆرماتی جیان.

## کردنەوەی فایل

لە فۆتۆشۆپدا ئەتوانیت بە خواستی خۆت ژمارەیەکی بێ سنوور لە فایل بکەیتەوە، بەمەرجێك لە توانای کۆمپیوتەرەکەتدا بێت.

ڕێگای زۆرمان هەیە بۆ کردنەوەی فایل، لێرەدا باسی دوو ڕێگا دەکەین.



## دراگ و درۆپ (1)

1. فۆتۆشۆپ بکەرەوە.
2. ئەو فۆڵدەرە بکەرەوە کە وێنەکەی تێدایە، بۆ نموونە My Documents.

3. وێنەیەك دراگ و درۆپ بكە بۆ ناو فۆتۆشۆپ. واتە كلیك لەسەر وێنەكە بكە، پاشان بەبێ پەنجە هەڵگرتن لەسەر كلیك ماوسەكە ڕابكێشە بۆسەر فۆتۆشۆپ، پاشان پەنجە لەسەر كلیك هەڵبگرە. فۆتۆشۆپ وێنەكەت بۆ دەكاتەوە.



## دراگ و درۆپ (2)

1. ئەگەر فۆتۆشۆپ كرابوویەوە بەڵام مینیمایز كرابوو، وێنەكە ڕابكێشە بۆسەر ئایكۆنی فۆتۆشۆپ لە تاسكباڕدا.



2. ئێستا فۆتۆشۆپ دەکرێتەوە لە شاشەکەدا. وێنەکە ڕابکێشە بۆ ناو فۆتۆشۆپ.



## دراگ و درۆپ (3)

1. ئەگەر فۆتۆشۆپ نەکرابوویەوە، وێنەکە ڕابکێشە بۆسەر ئایکۆنی فۆتۆشۆپ لەسەر شاشەکە یان لە ناوچەی کویک لۆنچ دا.



2. فۆتۆشۆپ دەكرێتەوە بە وێنەكەوە.



## كردنەوەی فایل لەناو فۆتۆشۆپەوە

1. لە مێنیوی File دا كلیك لەسەر Open بكە.




2. دایەلۆگ بۆكسی Open دەكرێتەوە. لێرەدا كلیك لەسەر شوێنێك بكە لە كۆمپیوتەرەكەتدا بۆ ئەوەی وێنەكەتی تێدا بدۆزیتەوە. بۆ نموونە ئەگەر وێنەكەت لە فۆڵدەری My Pictures دایە، سەرەتا كلیك لەسەر My Documents بكە.



3. دەبل کلیك لەسەر فۆڵدەری My Pictures بکە.



4. کلیك لەسەر ئەو وێنەیە بکە کە ئەتەوێت بیکەیتەوە.



5. کلیك لەسەر دوگمەی Open بکە.



## بەکارهێنانی ئەدۆب بریج

ئەگەر تۆ چەند وێنەیەکی کەمت هەبێت و بە ڕێك و پێکی ناویان بنێیت ئەوا دۆزینەوەی ئەو وێنەیەی کە ئەتەوێت شتێکی سەخت نییە. بەڵام ئەگەر وەك من هەزاران وێنەت هەبێت و بە هەموو شوێنێکدا بڵاو بووبنەوە، ئەوا ئەکرێت دۆزینەوەی وێنەی خوازراو کاتێکی زۆری پێ بچێت. لێرەدایە کە گرنگی پرۆگرامی بریج دەردەکەوێت. بەرنامەی بریج (Bridge، واتە پرد) یەکێك لە ئەو پرۆگرامانەی کە لەگەڵ فۆتۆشپی 10 دا دادەبەزن. بەرنامەی بریج یارمەتیت دەدات وێنەکانت تەماشا بکەیت، ڕێکیان بخەیت، بگەڕێیت بەناویاندا، هەروەها ئەو مێتاداتایە بخوێنیتەوە کە لەگەڵ وێنەکاندان. ئەتوانیت بەهۆی مێتاداتاوە بزانیت کە عەدەسەی کامێراکە لە چ بارێکدا بووە لە کاتی گرتنی وێنەکەدا، ئایا فلاش بەکارهێنراوە، هەروەها خولەك و چرکەی گرتنی وێنەکە، لەگەڵ زانیاری زۆری دیکە کە هەموو شتێکت پێ دەڵێن دەربارەی وێنەکە، جگە لە شوێنی گرتنی وێنەکە. بەڵام لە ڕاستیدا، ئێستا کامێرا هەیە کە پەیوەندی بە GPS ەوە هەیە و ئەتوانێت پێت بڵێت بە ووردی لە چ شوێنێکی زەویدا وێنەکە گیراوە.




1. بۆ کردنەوەی بریج، لە فۆتۆشۆپدا، لە مێنیوی File دا کلیك لەسەر Browse بکە.

2. بۆ دۆزینەوەی فۆڵدەرێك، کلیك لەسەر My Computer بکە و پاشان لە ڕووبەرەکەی ناوەڕاستدا بە فۆڵدەرەکاندا هاتوچۆ بکە.



3. بۆ گەورە و بچووککردنی پیشاندانی وێنەکان، ئەم سلایدەرە بجووڵێنە.




4. یەك كلیك لەسەر وێنەیەك بكە، لێرەدا مێتاداتاكەی بخوێنەرەوە.




5. بۆ کردنەوەی وێنەکە، دەبڵ کلیکی لەسەر بکە. وێنەکە لە فۆتۆشۆپدا دەکرێتەوە.

## خەزنکردنی ئیشەکەت



لە خەزنکردندا شتێکی گرنگ هەیە کە ئەبێت بیزانیت: زۆر ئەنجامی بدە! ئامرازەکانی کۆمپیوتەر هەندێك جاری تووشی کوژانەوەی لەپڕ دەبن یان کێشەیەك لە پرۆگرامەکەدا ڕوو دەدات و دادەخرێتەوە. ئەگەر ئیشەکەت خەزنکردبێت، ئەوا تەنها ئەوەندەت لەسەر کە دووبارە فایلەکەت بکەیتەوە، بەڵام ئەگەر خەزنت نەکردبێت، ئەوا ئەبێت سەرلەنوێ ئیشەکەت ئەنجام بدەیتەوە.

بۆ خەزنکردنی ئیشەکەت:

1. لە مێنیوی File دا کلیك لەسەر Save بکە.
2. لێرەدا شوێنێك دیاری بکە بۆ خەزنکردنی فایلەکەت.



3. لێرەدا ناوێکی گونجاو بۆ فایلی وێنەکە بنووسە.



4. لە لیستی Format دا فۆرماتێکی گونجاو بۆ وێنەکەت دیاری بکە.




5. لێرەدا هەڵبژاردنێکمان هەیە کە پێی دەوترێت Save as a copy. ئەم فەرمانە هەر وەکو Save As، ڕێگەت پێ ئەدات کە فایلەکەت بە ناوێکی نوێوە لە شوێنێکی نوێدا خەزن بکەیت، بەڵام جیاوازییان لەوەدایە کە کاتێك تۆ بە Save As شتێك خەزن دەکەیت، تۆ دەچیتە ناو فایلە نوێکەوە و لەوێدا ئیش ئەکەیت. بەڵام لە Save as a copy دا تۆ نوسخەیەك لە فایلەکەت لە شوێنێکدا خەزن دەکەیت و وازی لێ دێنیت، واتە دوای خەزنکردنەکە تۆ دەگەڕێیتەوە سەر فایلەکەی یەکەمجارت. بۆ تێگەیشتنی زیاتر ئەم نموونەیە بخوێنەوە: تۆ فایلێکت هەیە لە فۆڵدەری My Documents دا، دەیکەیتەوە لە فۆتۆشۆپدا و دەستکاری دەکەیت، پاشان بەهۆی Save As ەوە لەسەر دێسکتۆپ (Desktop)، واتە شاشەی سەرەکی کۆمپیوتەرەکەت) خەزنی دەکەیت. دوای خەزنکردنی، تۆ هەر ئیشێکی تر لەسەر فایلەکەت ئەنجام بدەیت، ئەوا تۆ لەسەر ئەو فایلە ئەنجامی ئەدەیت کە لەسەر دێسکتۆپ خەزنت کردووە، واتە فایلی دووەم. بەڵام ئەگەر تۆ Save as a copy بەکاربێنیت ئەوا دوای خەزنکردنی فایلەکە لەسەر دێسکتۆپ، هەر ئیشێکی تر ئەنجام بدەیت ئەوا لەسەر فایلی یەکەم ئەنجامی ئەدەیت کە لە فۆڵدەری My Documents دایە.



6. کلیك لەسەر Save بکە.



## بچووککردنەوەی قەبارەی فایل

کاتێك ئیش لەسەر فایلی جیاواز دەکەیت لە فۆتۆشۆپدا، لەوانەیە تێبینی بکەیت کە هارد دیسکی کۆمپیوتەرکەت خەریکە پڕ دەبێتەوە. فایلەکانی فۆتۆشۆپ ئەکرێت زۆر بە خێرایی گەورە بێن کاتێك تۆ ئیشی جیاوازیان لەسەر دەکەیت. ئەکرێت قەبارەی فایلەکان بە چەند ڕێگایەك کەم بکرێتەوە:



- بچووککردنەوەی ڕووبەری وێنەکە و ڕیسوڵوشنی.
- کەمکردنەوەی ژمارەی ڕەنگەکان لە وێنەکەدا.
- بەکارهێنانی فۆرماتێك کە فایلەکە کۆمپرێس (کەپس کردن یان چڕ کردنەوە) بکات.
- بەکارهێنانی پرۆگرامێکی کۆمپرێس کردنی فایل.
- تێکەڵکردنی لایەرەکانی ناو فایلێکی psd ی فۆتۆشۆپ.
- سڕینەوەی ئەو کەناڵانەی ئالفا کە ئیشت پێیان نییە.

کەم کردنەوەی ڕیسوڵوشنی وێنەکە بیرۆکەیەکی باش نییە ئەگەر ئەتەوێت وێنەکە پرنت بکەیت. ئەگەر وێنەکەت بۆ پیشاندانە لەسەر کۆمپیوتەر یان بۆ ئینتەرنێتە، ڕیسوڵوشنی وێنەکە کەم بکەرەوە بۆ 72 ppi. هەرگیز ڕیسوڵوشن لە 72 کەمتر مەکەرەوە، چونکە جوانیی وێنەکەت تێك دەدات.

بۆ کەم کردنەوەی ڕیسوڵوشنی وێنەیەك:

1. لە مێنیوی Image دا کلیك لەسەر Image Size بکە.
2. لە بۆکسی Resolution دا ژمارەیەکی نویێ داخلێ بکە.




3. کلیك لەسەر OK بکە.




کەم کردنەوەی ژمارەی ڕەنگەکانی ناو وێنەیەك واتە کەم کردنەوەی قووڵی bit. ئەکرێت ئەمەش ببێتە هۆی پەڵە پەڵە کردنی وێنەکەت و دوورخستەوەی شێوەی ڕەنگەکان لە ڕاستی. بەڵام ئەگەر وێنەکەت ڕەش و سپییە، وا چاکە وێنەکەت بکەیت بە Grayscale کە قووڵی bit ەکەی 8 ە، ئەمەش 256 جۆر لە ڕەنگت پێ ئەدات لە نێوان سپی و ڕەشدا (واتە لە سپییەوە بۆ ڕەساسی کاڵ و پاشان بۆ ڕەساسی تۆخ و ڕەش)، ئەمەش لەوە زیاترە لە پرنتەرێك بتوانێت پیشانی بدات. بۆ گۆڕینی وێنەیەك بۆ Grayscale:




1. لە مێنیوی Image دا ماوسەکەت لەسەر Mode بووەستێنە و کلیك لەسەر Grayscale بکە.

بەکارهێنانی فۆرماتێکی کۆمپرێس کراو واتە بەکارهێنانی فۆرماتێکی وەك TIFF كە. بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی قەبارەی وێنەکەت کەم دەکاتەوە بەهۆی بەکارهێنانی شێوازی کۆمپرێس کردنی LZW. ئەم شێوازی کۆمپرێسکردنە شێوازێکی تایبەتییە کە پێی دەوترێت lossless compression، واتە کۆمپرێس کردنێك کە زانیاریی وێنەکەت کەم ناکاتەوە، بە واتایەکی تر هیچ گۆڕانکارییەك بەسەر دیمەنی وێنەکەتدا نایەت. فۆرماتەکانی GIF و PDF یش LZW (کە لە دوای داهێنەرەکانیەوە، Lempel، Ziv و Welch ەوە ناو نراوە) بەکاردەهێنن.

جۆرێکی تر لە فۆرمات هەن، وەك JEPG (.jpg) کە شێوازێی کۆمپرێسکردن بەکاردەهێنن کە پێیان دەوترێت lossy compression، واتە کۆمپرێس کردنێك کە زانیاریی وێنەکە کەم بکاتەوە، ئەنجامەکەشی ئەوەیە کە دیمەنی وێنەکەت کەمێك گۆڕانی بەسەرا دێت. بۆ نموونە ئەگەر وێنەکەت وێنەیەکی ئاسمان بێت بە فۆرماتی TIFF و تیایدا 20 جۆر لە ڕەنگی شینی تێدابێت، ئەوا کە کردت بە JPEG ژمارەیان دەبێت بە 5 جۆر. وە تۆش کاتێك تەماشای دوو وێنەکە ئەکەیت هەست بە جیاوازییەکە دەکەیت. گرنگی JPEG لەوەدایە کە فایلەکەی کەمترین شوێن داگیر دەکات لەسەر هارددیسکەکەت.

شتێك کە پێویستە لەبیرت بمێنێت ئەوەیە کە ئەگەر وێنەیەکی JPEG ت هەبێت و ئیشی لەسەر بکەیت و دووبارە بە JPEG خەزنی بکەیت ئەوا وێنەکەت جارێکی تر کۆمپرێس دەکرێت و وێنەکەت زانیاری زیاتر لەدەست دەدات. واتە ئەگەر یەکەمجار لە ئاسمانەکەدا 5 ڕەنگی شین هەبێت ئەوا دووەم جار دەبێت بە 3. بۆیە وا چاکە سەرەتا وێنەکەت لە شێوەی فایلی فۆتۆشۆپدا خەزن بکەیت (psd) و هەر ئەمە بەکاربێنیت هەتا ئەو کاتەی کە نوسخەی کۆتایی وێنەکەت بەرهەم دەهێنیت.

دوای خەزنکردنی فایلەکەت، ئەتوانیت بەهۆی پرۆگرامێکی کۆمپرێس کردنەوە وەك WinRAR کۆمپرێسی بکەیت بۆ ئەوەی قەبارەکەی بچووکتر بکەیتەوە. بەڵام کۆمپرێس کردنی وێنەی JPEG و GIF بێسوودە و قەبارەیان کەمتر ناکاتەوە چونکە خۆیان کۆمپرێس کراون.

لە خوارەوەدا وێنەیەکی دیجیتاڵی ئاساییمان هێناوە کە بە چەند فۆرماتێکی جیاواز خەزنمان کردووە، تەماشای جیاوازی قەبارەی فایلەکانیان بکە. پانیی وێنەکە 5 ئینچە و ڕیسۆلوشنەکەی 200ppi ە.



| فۆرمات | قەبارەی فایل |
|---|---|
| فۆتۆشۆپ (psd) | 1.97MB |
| BMP | 1.97 MB |
| EPS | 2.82MB |
| GIF | 536KB |
| JPEG (high quality) | 272KB |
| JPEG (low quality) | 192KB |
| PDF (medium quality) | 188KB |
| PNG (interlaced) | 1.3MB |
| TIFF (LZW compression) | 1.4MB |

## هەڵبژاردنی فۆرماتێکی گونجاو

کاتێك ئەم هەموو فۆرماتانەت لەبەردەستدایە، چون بزانیت چ فۆرماتێك بەکاربێنیت؟ لە ڕاستیدا هەڵبژاردنی فۆرماتێکی گونجاو کارێکی قورس نییە.

کاتێك کە ئیشی بەردەوام ئەکەیت لەسەر وێنەیەك، لە فۆرماتی Photoshop (.psd) دا خەزنی بکە، ئەمەش زۆر گرنگە کاتێکی فێری بەکارهێنانی لایەرەکان دەبیت، چونکە فۆرماتی psd لایەرەکان خەزن دەکات لە کاتێکدا زۆربەی فۆرماتەکانی تر لایەر خەزن ناکەن. هەروەها دەقی نووسراو لەسەر وێنەکان لە فۆرماتەکانی تیکەدا دەبن بە بەشێك لە وێنەکە و ناتوانرێت دەستکاری بکرێن.

بۆیە، ئەنجامی ئەم قسانە ئەوەیە کە ئەگەر هەست دەکەیت پێویستت بەوە دەبێت دووبارە دەستکاری وێنەکە بکەیت، بە psd خەزنی بکە.



دوای ئەوەی ئیشت لەسەر وێنەکە تەواو دەبێت، ئەتوانیت لە فۆرماتی TIFFی دا خەزنی بکەیت کە لەگەڵ زۆربەی پرنتەر و بەرنامەکاندا کار دەکات. ئەگەر وێنەکەت بۆ لاپەڕەیەکی سەر ئینتەرنێتە، فۆرماتی GIF یان PNG-8 بەکاربێنە بە مەرجێك بابەتی وێنەکە بریتی بێت لە وێنەیەك کە بە هۆی کۆمپیوتەرەوە دروست کرابێت (وەك وێنەی کلیپ ئارت)، یاخود لە هێڵکاری پێکاهتبێت، یان ڕووبەری گەورەی تێدابێت کە یەك ڕەنگی هەبێت. یان وێنەکە ڕەنگی کەمی تێدا بەکارهاتبێت.

وێنەیەك کە بۆ فۆرماتی GIF و PNG-8 شیاوە:



بەڵام JPEG یان PNG-24 هەڵبژێرە ئەگەر وێنەکەت وێنەیەکی فۆتۆگرافە (لە کامێراوە وەرگیراوە) یاخود ڕەنگی زۆری تێدایە.

وێنەیەك کە بۆ فۆرماتەکانی JPEG و PNG-24 شیاوە:

ئەگەر ئەتەوێت وێنەیەکی ناو فۆتۆشوپ لە پرۆگرامێکی دیکەدا بەکاربێنیت، فۆرماتی PSD بەکاربێنە ئەگەر پرۆگرامەکەی تر ئەتوانیت بیخوێنێتەوە، ئەگەر نەیتوانی ئەوا TIFF هەڵبژێرە (بۆ ئەوەی ئاستی جوانی و ڕوونی وێنەکەت کەم نەبێتەوە).

## ئەندو و ڕیدو

بەکارهێنەرانی نوێی کۆمپیوتەر پاش ماوەیەکی کەم فێری زاراوەکانی ئەندو و ڕیدو دەبن. تۆ ئەندو ئەنجام ئەدەیت کاتێك پەشیمان ئەبیتەوە لە گۆڕانکارییەك کە ئەنجامت داوە و ڕیدو کاتێك ئەنجام ئەدەیت کە پەشیمان ئەبیتەوە لە پەشیمان بوونەوەکەی پێشترت. واتە بۆ نموونە تۆ ئیش لەسەر وێنەیەك ئەکەیت و ڕووبەرەکەی بچووك دەکەیتەوە ، بەڵام لەپڕ هەست ئەکەیت کە ڕووبەرەکەی پێشوو جوانتربوو، لەم حاڵەتەدا تۆ ئەندو ئەکەیت بۆ ئەوەی بگەڕێنیتەوە بۆ سەر قەبارە گەورەکە، واتە یەك هەنگاو دەگەڕێنیتەوە دواوە. پاشان دابیرت دێتە پێشەوە و ئەڵێت کوڕم (یان کچم) وەڵا ڕووبەرە بچووکەکەم لا خۆشتربوو، بۆیە تۆ بڕیار ئەدەیت دووبارە وێنەکە بچووك کەیتەوە. ئەتوانیت دووبارە بە هەنگاوەکاندا بچیت بۆ بچووککردنەوەی وێنەکە، بەڵام ئەشتوانیت فەرمانی ڕیدو بەکاربێنیت، واتە یەك هەنگاو بۆ پێشەوە، بۆ ئەوەی وێنەکە بگەڕێنیتەوە بۆ سەر ئەو بارەی کە پێش ئەندو هەیبوو.



لە فۆتۆشۆپدا زۆرجار پێویستت بەوە دەبێت کە چەند هەنگاوێك بۆ دواوە بڕۆیت، پاشان چەند هەنگاوێك بۆ پێشەوە. خۆشبختەتانە فۆتۆشۆپ چەند ئامرازێکی بەهێزی بۆ ئەم مەبەستە هەیە.

لە پالیتی History دا یەك لە دوای یەك هەموو ئەو گۆڕانکارییانەت پیشان دەدرێت کە تۆ لەسەر وێنەکە ئەنجامیان ئەدەیت، تۆش ئەتوانیت کلیك لەسەر هەنگاوێك بکەیت و بگەڕێیتەوە سەر ئەو هەنگاوە.

بۆ کردنەوەی پالیتی History:

1. کلیك لەسەر ئایکۆنی پالیتی History بکە.
2. لە پالیتەکەدا کلیك لەسەر کردارێك بکە بۆ ئەوەی بگەڕێیتەوە سەر هەنگاوەکەی.



بۆ ئەنجامدانی یەك ئەندو، Ctrl+Z بکە (پەنجە بە کلیلی Ctrl دا بنێ لەسەر کیبۆردەکەت، پاشان بەبێ پەنجە هەڵگرتن لەسەر Ctrl پەنجە بە کلیلی Z دا بنێ). ئەگەر دوبارە Ctrl+Z بکەیت ئەوا فرمانێکی ڕیدو بە ئەنجام دەگات. واتە بەهۆی Ctrl+Z ەوە ئەتوانیت تەنها یەك هەنگاو بۆ دواوە لەگەڵ یەك هەنگاو بۆ پێشەوە بڕۆیت.

بۆ هەنگاوی زیاتر، Alt+Ctrl+Z بکە بۆ هەنگاونان بۆ دواوە، Shift+Ctrl+Z بکە بۆ هەنگاونان بۆ پێشەوە.

# بەشی چوارەم:

# سیـلـێکـت کـــــــردن




## ئامرازی سێلێکت کردنی مارکیی لاکێشەیی و هێلکەیی




ئامرازەکانی سێلێکت کردنیی مارکیی لاکێشەیی و هێلکەیی لە سووچی سەرەوەی چەپی تووڵبۆکسەکەدان. بۆ بەکارهێنانی مارکیی لاکێشەیی، کلیکی لەسەر بکە یاخود پەنجە بە کلیلی M دا بنێ لەسەر کیبۆردەکەت.




بۆ بەکارهێنانی مارکیی هێلکەیی، کلیکی ڕاست لەسەر ئایکۆنی مارکی بکە، پاشان لە مێنیوەکەدا کلیك لەسەر مارکی هێلکەیی بکە. ئەشتوانیت کلیکی چەپ بکەیت و ماوەیەك دەست دابگریت تا مێنیوەکە دەردەکەوێت).




بۆ سێلێکت کردنی دوو و زیاتر لە دوو ڕووبەری جیاواز لە وێنەکەتدا ئەم هەنگاوانە بەکاربێنە:

1. ئامرازی مارکی لاکێشەیی هەڵبژێرە.
2. ڕووبەرێك لەسەر وێنەکە سێلێکت بکە.

3. پەنجە لەسەر کلیلی Shift دابنێ لەسەر کیبۆردەکەت (پەنجە هەڵمەگرە).
4. ئامرازی مارکی هێلکەیی هەڵبژێرە.
5. رووبەرێك لەسەر وێنەکەت سێلێکت بکە.




**بۆ سێلێکت کردنی ناوچەیەك کە چوارگۆشەیەکی تەواو بێت (بەرزی و پانییەکەی یەکسان بێت) یاخود بازنەیەکی تەواوبێت:**

1. پاش هەڵبژاردنی ئامرازی مارکی لاکێشەیی یان هێلکەیی، لە ئۆپشنزبارِدا کلیك لەسەر لاکێشەی Style بکە و لە لیستەکەدا Fixed Ratio هەڵبژێرە.



2. پاشان لە بۆکسەکانی Width و Height دا ژمارە (1) داخڵ بکە.




بۆ دەرکردنی ڕووبەرێك لە ناوچە سێلێکت کراوەکە، واتە بۆ نموونە تۆ وێنەیەکت هەیە کە چوارچێوەیەکی هەیە و تۆ تەنها ئەتەوێت چوارچێوەکەی سێلێکت بکەیت، ئەوا دوای سێلێکت کردنی هەموو وێنەکە، پەنجە بە کلیلی Alt دا بنێ (ئیشارەتی ماوسەکە دەبێت بە هێمای لێدەرکردن) و ناوەوەی وێنەکە دیسێلێکت بکە. دیسێلێکتکردن هەروەك سێلێکت کردن ئەنجام ئەدرێت بەڵام ئەنجامەکەی پێچەوانەیە، ڕووبەرێکی دیاریکراو لە ڕووبەرە سێلێکتکراوەکە دەر دەکات.

ئامرازەکانی مارکی Single Row و Single Column بە ئەستووری یەك پیکسێل و بەو درێژییەی کە خۆت دەتەوێت ڕووبەرێکت بۆ سێلێکت دەکەن. ئەم ئامرازەش بۆ سێلێکت کردنی لێواری وێنەیەك سوودی هەیە کە بتەوێت لێوارەکە بسڕیتەوە.

کاتێك ئیش لەگەڵ ڕووبەرێکی سێلێکت کراو دەکەیت پێویستە ئەوەت لەبیر بێت کە ئەتوانیت تەنها ئیش لەسەر ڕووبەرە سێلێکت کراوەکە بکەیت، ڕووبەرەکانی تر لوك دەبن. لەبەر ئەمە، کاتێك ڕووبەرێك سێلێکت دەکەیت، ئەتوانیت بە ئارەزووی خۆت ئیشی لەسەر بکەیت، بەڵام پێش ئەوەی دەست بکەیت بە ئیشکردن لەسەر ناوچەیەکی تر پێویستە ڕووبەرەکە لە دۆخی سێلێکتکردندا لاببەیت (سێلێکت کردنەکە نەهێڵیت). ئەتوانیت ئەم کردارە ئەنجام بدەیت بە کلیك کردن لەسەر ڕووبەرێکی سێلێکت نەکراو کاتێك یەکێك لە چوار ئامرازەکەی مارکیت هەڵبژاردووە، یاخود بە پەنجە نان بە کلیلەکانی Ctrl+D لەسەر کیبۆردەکەت.

ئەتوانیت ڕووبەری سێلێکت کراو بسڕیتەوە بە پەنجە نان بە کلیلی Delete دا.



## ئامرازی لاسوو

لەگەڵ ئەوەی کە ئامرازەکانی مارکی زۆر بەسوودن و بە چەندین ڕێگە بەکاردەهێنرێن، هەندێك جار پێویستت بەوە دەبێت کە ڕووبەری ناڕێك سێلێکت بکەیت. بۆ یەك گوڵ لە ناو چەپکێك گوڵدا، یاخود پشیلەیەك.

بەکارهێنانی ئامرازی لاسوو بۆ ئەم جۆرە سیلێکتکردنانە پێویستی بە دەستێك هەیە کە نەلەرزێت، چاوێکی تیژ، لەگەڵ ماوس و ماوسپادێکی پاك.




بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی وورد و ڕێك و پێك ئامرازی لاسوو بەکاربێنیت خێرایی جووڵانی ماوسەکەت کەم بکەرەوە لە کۆنترۆڵ پانێڵدا.

بۆ سیلێکتکردن لە ڕێگەی ئامرازی لاسووەوە:

1. کلیك لەسەر ئامرازی لاسوو بکە یاخود پەنجە بە کلیلی L دا بنێ.
2. کلیك بکە و ماوسەکە ڕابکێشە بە دەوری ئەو بەشەدا کە ئەتەوێت سیلێکتی بکەیت. لە وێنەکەی خوارەوەدا سەری پیرەمێردی ڕیش سپی، کە چیرۆك بێژێکی خەڵکی تبتبە، مان سیلێکت کردووە لەگەڵ ڕیشە سپییەکەیدا.




3. کاتێك کە نزیکە دەگەیتە کۆتایی پرۆسەی ڕاکێشانی ماوسەکە بە دەوری پارچەکەدا، ئەتوانیت پەنجە لەسەر کلیك هەڵبگریت و فۆتۆشۆپ سیلێکتکردنەکەت بۆ تەواو دەکات، بەڵام سیلێکتکردنەکەت بەشێوە هێڵێکی ڕاست بۆ تەواو دەکات، بۆیە ئەگەر زوو پەنجە هەڵبگرێت ئەوا بە شێوەیەکی ناتەواو پارچەکە سیلێکت دەبێت. ئەگەر ئەمە ڕووی دا ئەتوانیت پەنجە بە کلیلی Shift دا بنێیت و سیلێکتکردنەکە تەواو بکەیت.

## ئامرازی لاسووی چەندلا



ئامرازی لاسووی چەندلا (Polygonal Lass Tool) کارکردنی وەك ئامرازی لاسووی ئاسایی وایە، بەڵام ئەم ئامرازە بە شێوەیەکی نارێك و پێك پارچەهێڵی ڕاست بە دەوری ڕووبەرێکدا دروست دەکات. بۆ نموونە لە وێنەکەی خوارەوەدا خانووەکەیس لای ڕاستمان سیلێکت کردووە:




**بەکارهێنانی لاسووی چەندلا:**

١. **کلیکی ڕاست لەسەر ئامڕازی لاسوو بکە.**

٢. **کلیك لەسەر ئامڕازی لاسووی چەندلا بکە.**







٣. **کلیك لەسەر کانڤاس بکە. پاشان ماوسەکە بجوولێنە، دەبینیت کە هێڵێك شوێنی ماوسەکەت دەکەوێت.**

٤. **کلیکێکی تر بکە. فۆتۆشۆپ هێڵێکت بۆ دروست دەکات و خاڵێکت بۆ دادەنێت کە لێیەوە ئەتوانیت هێڵێکی تر دروست بکەیت.**





5. بەردەوام بە لە جوولاندنی ماوسەکە و کلیك کردن تا ناوچە خوازراوەکەت سێلێکت دەکەیت.



6. لە کۆتاییدا کاتێك ئیشارەتی ماوسەکە نزیك دەبێتەوە لە خاڵی سەرەتا، دەبینیت کە بازنەیەکی بچووك لە تەنیشت ئیشارەتەکەوە دروست دەبێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە تۆ ئەتوانیت کلیك بکەیت بۆ تەواوکردنی سێلێکت کردنەکە. ئەشتوانیت دەبڵ کلیك یان Enter بکەیت لە شوێنێکی نزیکییەوە و فۆتۆشۆپ سێلێکتکردنەکەت بۆ تەواو دەکات.

## ئامرازی لاسووی موگناتیسی

ئامرازی لاسووی موگناتیسی یەکێکە لەو ئامرازانەی کە زۆر بەکاردێن. کاتێك ماوسەکە ڕادەکێشیت بەسەر شێوەیەکدا کە سنوورێکی تا ڕادەیەك دیاری هەبێت، ئامرازەکە ڕاستەوخۆ دەلکێت بە سنوورەکەدا. ئەم ئامرازە هەڵبژێرە هەر وەك چۆن ئامرازی لاسووی چەندلات هەڵبژارد. ئەتوانیت لە ئۆپشنزباڕدا چەند هەڵبژاردنێکی بۆ دیاری بکەیت. Width (پانی) دیاری دەکات کە ئامرازەکە چەند لە سنوورێکەوە دوور بێت بۆ ئەوەی ئامرازەکە بلکێت بە سنوورەکەدا. Contrast دیاری دەکات کە ڕووناکی ئەو پیکسێلانەی ئەتەوێت سێلێکتیان بکەیت چەندە جیاواز بن لە ڕووناکی ڕووتەختەکە. Frequency ژمارەی ئەو خاڵی لەنگەرانە دیاری دەکات کە ئامرازەکە دایان دەنێت. (ئەتوانیت ئەم خاڵانە ڕابکێشیت بۆ ئەوەی هێڵی سێلێکتکردنەکە کەمێك بجووڵێنیت.)





# ئامرازی سێلێکتکردنی خێرا

ئامرازی سێلێکتکردنی خێرا (Quick Selection Tool) یەکێکە لە ئامرازە نایابەکانی فۆتۆشۆپی 10. ئەو ئامرازانەی کە پێشتر باسمان کردن ڕووبەرێکی دیاریکراویان سێلێکت دەکرد بە ڕێگەی جیاواز. بەڵام ئامرازی سێلێکتکردنی خێرا و ئامرازی تووڵی سیحری ( Magic Wand) بە پشت بەستن بە ڕەنگی ناوچەکان ڕووبەرێکمان بۆ سێلێکت دەکەن.



ئامرازی سێلێکتکردنی خێرا وەکو فڵچەیەك بەکاردێت کە ناوچەیەکی پێ ڕەنگ دەکەیت، کاتێك کە ماوسەکە ڕادەکێشیت فۆتۆشۆپ ئەو پیکسێلانەت بۆ سێلێکت دەکات کە ماوسەکەی بەسەردا ڕادەکێشیت، لەگەڵ ئەو پیکسێلانەی دەوروبەر کە هەمان ڕەنگیان هەیە.

بۆ بەکارهێنانی ئامرازی سێلێکتکردنی خێرا وەدووی هەنگاوەکانی خوارەوە بکەوە:

1. کلیك لەسەر ئامرازی سێلێکتکردنی خێرا بکە لە تووڵبۆکسەکەدا، یاخود پەنجە بنێ بە کلیلی W دا.
2. لە ئۆپشنزبارەدا کلیك لەسەر سەهمی سەربەرەوخواری Brush بکە.



3. سلایدەری Diameter بجووڵێنە بۆ دیاریکردنی گەورە و بچووکی ئامرازەکە



4. ماوسەکەت ڕابکێشە بەسەر ئەو ناوچانەدا کە ئەتەوێت سیلێکتیان بکەیت.




5. بۆ لابردنی ڕووبەرێك لە سیلێکتکردنەکە، پەنجە بە کلیلی Alt دا بنێ و ماوسەکە ڕابکێشە بەسەر ڕووبەرەکەدا.

## تووڵی سیحری

ئەگەر حەزت لە ئیشی ئامرازی سیلێکتکردنی خێرایە، بەڵام ئەتەوێت کۆنترۆڵی زیاترت هەبێت بەسەر پرۆسەی سیلێکتکردنەکەدا، ئەوا ئامرازی تووڵی سیحری بۆ تۆیە. بەهۆی ئەم ئامرازەوە ئەتوانیت بە پشت بەستن بە ڕەنگ شوێنی جیاواز لە وێنەکە دیاری بکەیت، بەڵام لەجیاتی ڕاکێشانی ماوسەکە تۆ تەنها کلیك دەکەیت.

گرنگترین جیاوازی تووڵی سیحری لەگەڵ ئامرازی سیلێکتکردنی خێرا ئەوەیە کە لە تووڵی سیحریدا ئەتوانیت دیاری بکەیت کە ڕەنگەکان چەند لەیەك بچن بۆ ئەوەی ئامرازەکە سیلێکتیان بکات، بە کەم و زیاد کردنی ڕادەی Tolerance.

هەتا Tolerance کەمتربێت، تووڵی سیحری ڕەنگی کەمتر سیلێکت دەکات. لەبەر ئەمە ئەگەر Tolerance زیاد بکەیت ئەوا جۆری زیاتر لە هەمان ڕەنگ سیلێکت دەکات. لە بۆکسی Tolerance دا ئەتوانیت لە 0 ەوە تا 255 داخڵ بکەیت.

وەك ئامرازەکانی تر، ئەتوانیت کلیك لەسەر Shift بکەیت و کلیك لەسەر ناوچەیەك بکەیت بۆ ئەوەی بۆ سیلێکتکردنەکە زیاد بکرێت.




بۆ بەکارهێنانی ئامرازی تووڵی سیحری:

1. کلیکی ڕاست لەسەر ئامرازی سیلێکتکردنی خێرا بکە.




2- کلیك لەسەر ناوچەیەك بکە لە وێنەکەدا بۆ سیلێکت کردنی. لە وێنەکەی خوارەوەدا کلیکمان لەسەر تیشێرتی کوڕەکە کردووە، چونکە نزیکەی هەموو تیشێرتەکە یەك ڕەنگی هەیە، هەمووی سیلێکت بووە، بێجگە لە وێنەکەی ناوەڕاستی تیشێرتەکە کە ڕەنگێکی جیای هەیە.

لە ئۆپشنزباڕدا ئۆپشن بۆکسی Contiguous ت هەیە. ئەگەر چێك کرابێت (ئیشارەتی لێ درابێت)، ئەوا کاتێك کلیك لەسەر ناوچەیەك دەکەیت، ئەوا هەموو ئەو ڕەنگانە سیلێکت دەبن کە لکابن بە ناوچەکەدا، واتە کە ڕەنگێکی تریان لە نێواندا نەبێت. بۆ نموونە وێنەیەکت هەیە کە دوو گوڵی زەردی تێدایە لە سەر ڕووتەختێك باکگراوندێك) ی سەوز. کاتێك ئەم بۆکسە چیك کرابێت، کاتێك کلیك لەسەر یەکێك لە دوو گوڵەکە دەکەیت، تەنها گوڵی یەکەمیان سیلێکت دەبێت، چونکە لە نێوان دوو گوڵەکەدا ناوچەیەك هەیە کە ڕەنگی سەوزە و دوو گوڵە زەردەکەی لەیەکتر جیا کردووەتەوە.
بەڵام ئەگەر چێك نەکرابێت، ئەوا کاتێك کلیك لەسەر گوڵی یەکەم دەکەیت، گوڵی دووەمیش سیلێکت دەبێت. واتە کاتێك کلیك لەسەر ڕەنگێك دەکەیت، لە هەر شوێنێکی تر لە وێنەکەدا ئەم ڕەنگە دووبارە بێتەوە ئەوا سیلێکت دەبێت.

| Select | |
|---|---|
| All | Ctrl+A |
| Deselect | Ctrl+D |
| Reselect | Shift+Ctrl+D |
| Inverse | Shift+Ctrl+I |
| All Layers | Alt+Ctrl+A |
| Deselect Layers | |
| Similar Layers | |
| Color Range... | |
| Refine Edge... | Alt+Ctrl+R |
| Modify | ▸ |
| Grow | |
| Similar | |
| Transform Selection | |
| Load Selection... | |
| Save Selection... | |

## مێنیوی Select

سەرەڕای ئامڕازەکانی سیلێکتکردن کە لە تووڵبۆکسی فۆتۆشۆپدا هەن، مێنیویەکی سیلێکتیشمان هەیە. گرنگترین کۆماند (فەرمان) ەکانی سەر ئەم مێنیووە چوار کۆماندی یەکەمن.

کۆماندی All هەموو کانڤاسەکە سێلێکت دەکات. Deselect سێلێکتکردن لادەبات. Reselect دووبارە ناوچەکان سێلێکت دەکاتەوە ئەگەر هاتو بە هەڵە سێلێکتکردنەکەت لابرد. Inverse سێلێکتکردنەکە پێچەوانە دەکاتەوە، بۆ نموونە ئەگەر یەکەمجار تۆپێك هەڵبژێریت کە لەسەر باکگراوندێکی ڕەش بێت، ئەوا کاتێك کۆماندی Inverse بەکاردەهێنیت باکگراوندە ڕەشەکە سێلێکت دەبێت بێجگە لە تۆپەکە. ئەم کۆماندە گرنگە و زۆر بەکاردێت.

## دەستکاریکردنی سێلێکتکردنەکان




مێنیوی Modify کە لە ناو مێنیوی Select دایە چەند هەڵبژاردنێکی ترت پێ ئەدات بۆ ئیشکردن لەسەر سێلێکتکردنەکانت. Border ڕووبەرە سێلێکتکراوەکە دەگۆڕێت بۆ ئەوەی لەجیاتی ئەوەی هەموو ئۆبجێکتەکە سێلێکت بکەیت تەنها سنوورێك بە دەوری ئۆبجێکتەکەدا سێلێکت دەبێت، ئەتوانیت ئەستووری چوارچێوەکە دیاری بکەیت.

Smooth بەسوودە کاتێك بە دەستێکی لەرزانەوە بەهۆی لاسووەوە سێلێکتکردنێکت ئەنجامداوە. Expand و Contrast سێلێکتکردنەکەت گەورە یان بچووك دەکەنەوە بە ئەو ڕادەیەی خۆت دیاری دەکەیت.

بەڵام، گرنگترین کۆماند لە مێنیوی Modify دا بریتییە لە کۆماندی Feather.



کۆماندی Feather سێلێکتکردنەکان "نەرم" دەکاتەوە. واتە سووچی تیژیان تێدا ناهێڵێت و سنوورەکان کاڵ دەکاتەوە. ئەمەش سوودی زۆرە کاتێك بابەتێك لە وێنەیەکدا سێلێکت دەکەیت بۆ ئەوەی بیخەیتە ناو وێنەیەکی ترەوە چونکە سنووری وێنەکە نەرم دەکات و یارمەتی دەدات لە وێنە نوێکەدا بەشێوەیەکی جوان دیار بێت.



ئەتوانیت دایەلۆگ بۆکسی Feather Selection بەکاربێنیت بۆ دیاریکردنی ڕادەی نەرمکردنەکە.

بۆ بەکارهێنانی Feather:

1. ڕووبەرێك سێلێکت بکە بەهۆی یەکێك لە ئامرازەکانی سێلێکت کردنەوە.

٢- پاشان لە مێنیوی Select دا Modify هەڵبژێرە و کلیك لەسەر Feather بکە




٣- پاشان لە دایەلۆگ بۆکسی Feather Selection دا ژمارەیەك داخڵ بکە بۆ دیاریکردنی بەهێزی نەرمکردنەوە/کاڵکردنەوەی سنووری سێلێکتکردنەکە. بە خواستی خۆت چەند ژمارەیەك تاقی بکەرەوە تا ئەو ئەنجامەت دەست دەکەوێت کە دەتەوێت.




٤- کلیك لەسەر OK بکە.

٥- شێوەی سنووری سێلێکتکردنەکە دەگۆڕێت بۆ شێوەیەکی ڕێك و پێك تر، وەك لە وێنەکەی خوارەوەدا دیارە:



6. ئێستا ئەگەر وێنەکە لە وێنەیەکی نوێدا دابنێیتەوە، ئەنجامەکە وەك خوارەوە دەبێت:



## سێلێکتکردنی ڕووبەری گەورە



زۆرجار پێویستت بەوە دەبێت کە بەشێکی گەورەی وێنەکە، بۆ نموونە ئاسمانەکە، سێلێکت بکەیت بۆ ئەوەی بتوانیت ڕەنگەکەی تاریکتر بکەیت یاخود گۆڕانکاری تری بەسەردا ئەنجام بدەیت بەبێ ئەوەی کاریگەری لەسەر ناوچەکانی تر هەبێت.

لەخوارەوەدا وێنەیەکمان هەیە کە ئاسمانی زۆرە و ئۆبجێکت (واتە تەن) ی ئاڵۆزی تێدایە، بۆ نموونە لقی درەختەکە. لە نێوان لقەکان و گەڵاکاندا بۆشایی هەن، ڕەنگی گوڵەکانیش لە هەندێك شوێندا وەك ڕەنگی ئاسمانەکە وایە.




بۆ سێلێکتکردنی ئاسمانەکە لەم وێنەیەدا:

1. ئامرازی تووڵی سیحری هەڵبژێرە.
2. ڕادەی Tolerance بکە بە 20. ئەمە وا دەکات کە تەنها ڕەنگە شینەکان سێلێکت ببن (کە لە ڕەنگدا لە یەکەوە نزیکن).

- ـڵنیا بکەرەوە لەوەی کە بۆکسی Contiguous چێك نەکراوە.





- کلیك لەسەر شوێنێکی ئاسمانەکە بکە.
- پەنجە بە کلیلی Shift دا بنێ و ناوچەکانی تری ئاسمانەکە و هەورەکان سێلێکت بکە.
- تەماشای نیشەکەت بکە، ئایا ناوچەی زیادەت سێلێکت کردووە؟ ئەگەر ئەمەت کردووە ئامرازێکی لاسوو هەڵبژێرە و پەنجە بە کلیلی Alt دا بنێ و ناوچە زیادەکان لە سێلێکتکردنەکە لاببە.
- ئێستا ئەتوانیت دەست بکەیت بە ئیشکردن لەسەر ئاسمانەکە، وەك گۆڕینی ڕەنگ یان ڕووناکی هتد.

## سێلێکتکردن بەپێی ڕەنگ



وەك پێشتر لەم بەشەدا فێر بوویت، ئامرازەکانی سێلێکتکردنی خێرا و تووڵی سیحری بەپێی ڕەنگ ناوچەکانی سێلێکت دەکەن. بەڵام بۆ ئەوەی بەکاریان بێنیت پێویستە بزانیت لەکوێدا کلیك بکەیت. ئەگەر ئیش لەسەر وێنەیەکی ئاڵۆز دەکەیت، لەوانەیە دۆزینەوەی ڕەنگێکی تایبەت لەنێو ڕەنگەکانی وێنەکەدا کارێکی گران بێت. فۆتۆشۆپ ئەتوانێت ئیشەکەت بۆ ئاسان بکات لەرێگەی کۆماندی Color Range (کەلەر ڕەینج) ەوە.

بۆ بەکارهێنانی ئەم کۆماندە:

1. لە مێنیوی Select دا کلیك لەسەر Color Range بکە.




2. دایەلۆگ بۆکسی Color Range دەکرێتەوە. کلیك لەسەر شوێنێك بکە لە وێنەکەدا بۆ دەستپێکردنی سیلێکت کردنەکە. ئەتوانیت لەسەر وێنە ئەسڵییەکە کلیك بکەیت، یاخود لەسەر وێنەی ناو دایەلۆگ بۆکسەکە. ئەو ناوچانەی لە دایەلۆگ بۆکسەکەدا بە سپی دەردەکەون ئەو ناوچانەن کە سیلێکت دەبن، ناوچە ڕەشەکانیش سیلێکت نابن.

3. سلایدەری Fuzziness ڕابکێشە بۆ زیادکردن یان کەمکردنەوەی ژمارەی ئەو ڕەنگانەی کە سیلێکت دەبن.




4. کاتێك کە ڕازیت بە ئەنجامەکە، کلیك لەسەر OK بکە.



ئەبینیت کە Color Range ئەو ڕەنگە سێلێکت دەکات کە دیاریت کردبوو، لەگەڵ ئەو ڕەنگانەی کە نزیکن لە ڕەنگەکەوە.



## کەت و کۆپی

ئەگەر فەرمانەکانی کەت یان کۆپی و پەیستت لە هەر پرۆگرامێکی دیکەدا بەکارهێنابێت، ئەوا ئەتوانیت لە فۆتۆشۆپیشدا بەکاریان بێنیت. ئەم فەرمانانە لەسەر مێنیوی Edit تن.



کەت و کۆپی و پەیست ڕێگەت پێ ئەدەن کە شت لە وێنەیەکەوە وەربگریت و لە وێنەیەکی تردا دایبنێیت.

لە خوارەوەدا باسی کۆپی کردن و دانانەوەی باڵندەیەکی ئەورەسی تەنها دەکەین بۆ ئەوەی چەند هاوڕێیەکی بۆ دروست بکەین.

وێنەکەی خوارەوە ئەورەسەکە بە سێلێکت کراوی پیشان دەدات Feather ێکی 3 پیکسێلیمان پێ داوە بۆ ئەوەی بە جوانی لە شوێنە نوێکانیدا جێی بێتەوە). وێنەکەمان بە پێنج ئەوەندە گەورە کردووە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕێکوپێکتر سێلێکتی بکەین.




دوای سێلێکتکردنی وێنەکە لە مێنیوی Edit دا کلیکمان لەسەر Copy کردووە. (ئەتوانیت Ctrl+C بەکاربێنیت).



پاشان نەورەسەکان چەند جارێك پەیست کردووە بە کلیك کردن لەسەر Paste لە مێنیوی Edit دا. دوای کۆپیکردنی بابەتێك، ئەتوانیت بە خواستی خۆت چەندین جار پەیستی بکەیت.

جیاوازی کەت (Cut) ئەوەیە کە بابەتەکە لێدەکاتەوە، پاشان ئەتوانیت پەیستی بکەیت.




## کرۆپ کردن

کرۆپ کردنی (Cropping) واتە بچووککردنەوەی وێنەیەك بە برین لە چوارچێوەکەی، یاخود واتە لێکردنەوەی پارچە نەویستراوەکانی وێنەیەك.

لە هەنگاوەکانی خوارەوەدا ئێمە تەنها منداڵەکەمان ئەوێت و ئەمانەوێت ناوچەکانی تری وێنەکە بسرینەوە:

1. کلیك لەسەر ئامرازی کرۆپ بکە لە تووڵبۆکسەکەدا، یاخود پەنجە بە کلیلی C دا بنێ لەسەر کیبۆردەکەت.
2. ئامرازەکە بەسەر وێنەکەدا ڕابکێشە بۆ دیاریکردنی ئەو ناوچەیەی کە ئەتەوێت بمێنێتەوە.



3. سنوورەکانی چوارچێوەکە ڕابکێشە بۆ ئەوەی منداڵەکە جوانتر دیاری بکەیت.



4. لە کۆتاییدا دەبڵ کلیك لەسەر ناوەوەی چوارچێوەکە بکە، یان پەنجە بە Enter دا بنێ بۆ کرۆپکردنی وێنەکە.

ئەنجامی کرۆپکردنەکە:



# بەشی پێنجەم:

# مۆدێل و مۆدەکانی ڕەنگ

## مۆدێلەکانی ڕەنگ

**مۆدێلەکانی ڕەنگ بریتین لە ڕێگای جیاواز بۆ نواندنی ڕەنگێك لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر یان لەسەر کاغەز.**

**چەند مۆدێلێکی ڕەنگمان هەیە:**

1. RGB (Red, Green, Blue)
2. CMYK (Cyan, Magenta, Yellow, Keyline=Black)
3. HSB (Hue, Saturation, Brightness)
4. CIE Lab




**لە خوارەوەدا ویندۆی** Adobe Color Picker **دەبینیت. ویندۆی** Color Picker **ڕێگای زۆرمان ئەخاتە بەردەست بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگێکی خوازراو بە بەکارهێنانی هەر مۆدێلێك کە بمانەوێت.**

**ئەتوانیت ئەم ویندۆیە بکەیتەوە لە ڕێگەی کلیك کردن لەسەر یەکێك لە لاکێشەکانی ڕەنگ لە خوارەوەی تووڵبۆکسەکەدا.**






سەرەڕای ویندۆی Color Picker، پالیتی ڕەنگمان هەیە:




بۆ کردنەوەی پالیتی ڕەنگ کلیك لەسەر ئایکۆنەکەی بکە لە ناوچەی پالیتەکاندا:

## مۆدێلی RGB

مۆدێلی RGB، کە شاشەکانی کۆمپیوتەر و تەلەفزیۆن بەکاری دەهێنن بۆ پیشاندان، نرخێك دادەنێت لە سفرەوە بۆ 255 بۆ هەر یەکێك لە ڕەنگە سەرەتاییەکانی RGB، کە بریتین لە سوور و سەوز و شین.

بابەتی تەکنیکی (ئەتوانیت ئەم پاراگرافە نەخوێنیتەوە ئەگەر تاقەتی سەر ئێشەت نییە): بۆ نموونە، ڕەنگی سەوزی تەواوی پوختە، نرخەکانی سوور و شین یەکسانن بە سفر، نرخی سەوزیشی یەکسانە بە 255. ڕەنگی سپی هەر سێ ڕەنگە سەرەتاییەکانی یەکسانە بە 255. ڕەنگی ڕەشیش هەر سێ ڕەنگەکانی یەکسانن بە 0. بۆ تێگەشتنی زیاتر: ئەم مۆدێلە سێ ڕەنگی سوور و سەوز و شین تێکەڵ دەکات بۆ دروستکردنی ڕەنگی خوازراو. (پێویستە ئەوەش بزانیت کە دوو جۆر ڕەنگمان هەیە لەم جیهانەدا، ڕەنگی تیشکی لەگەڵ ڕەنگی بۆیە (وەك بۆیەی ئاوی). بە تێکەڵکردنی هەموو ڕەنگە تیشکییەکان ڕەنگی سپیمان دەستدەکەوێت. بە تێکەڵکردنی هەموو ڕەنگەکانی بۆیە ڕەنگی ڕەشمان دەست دەکەوێت. لە تیشکدا ڕەنگە سەرەکییەکان یان سەرەتاییەکان بریتین لە سوور و سەوز و شین، بەڵام بۆ ڕەنگەکانی بۆیە ڕەنگە سەرەتاییەکان بریتین لە سوور و زەرد و شین. لەوانەیە بیرت بێت کە لە وانەی فیزیادا کاتێك ماموستا بازنەیەکی دەسووڕاندەوە کە هەموو ڕەنگەکانی لەسەر بوو، ڕەنگی بازنەکە دەبوو بە سپی. بەڵام ئەگەر لە وانەی هونەردا هەموو ڕەنگەکانت تێکەڵ بکردایە، ئەوا ڕەنگێکی قاوەیی لێڵ و نزیك لە ڕەشت بۆ دەردەچوو.

بە کورتی: لەبەر ئەوەی کۆمپیوتەرەکەت تیشك بەکاردەهێنێت بۆ پیشاندانی ڕەنگ، کۆمپیوتەرکەت مۆدێلی RGB بەکاردەهێنێت.

مەبەستمان لە نرخ بریتییە لە هێزی نیسبی ڕەنگەکە. گەورەترین نرخ بریتییە لە 255. ئەگەر هەر سێ ڕەنگەکەی RGB نرخیان 255 بێت، ئەوا بەهێزترین (و بە ووزە ترین) ڕەنگمان بۆ دەردەچێت کە سپییە (لەمەشەوە ئەوەت بۆ دەردەکەوێت کە ڕەنگی سپی لەشاشەی کۆمپیوتەردا زۆرترین زیان دەگەیەنێت بە چاوەکانت).

ئەگەر نرخی هەر سێ ڕەنگەکە بکەیت بە نیوە، واتە 128، ئەوا ڕەنگێکی ڕەساسی ناوەندیت بۆ دەردەچێت.

## مۆدێلی CMYK

مۆدێلی CMYK، کە بۆ پرنتکردن بەکاردێت، ڕەنگەکان دیاریدەکات بەهۆی ڕێژەی سەدیی ڕەنگەکانی شینی تێکەڵ بە سەوز (cyan)، سووری تۆخی تێکەڵ بە ئەرخەوانی (magenta)، زەرد لەگەڵ ڕەش. ئەم ڕەنگانەش بریتین لە ڕەنگەکانی مرەکەب (حیبر) ی پرنتەر، جا پرنتەرە ملەوەنەکەی ماڵەوە بێت یان پرنتەرە زەبەلاحەکانی موختەبەرەکان (پرنتەریش هەن کە ڕەنگی زیاتریان تێ دەکرێت).

## مۆدێلی HSB

کاتێك هونەرمەندان باسی ڕەنگ دەکەن، بە گشتی ئەوان ڕەنگ بەپێی چەند یاساییەك دیاری دەکەن کە پێی دەوترێت HSB. H واتە Hue، ئەمیش واتە ڕەنگێك لە ڕەنگە بنچینەییەکانی ویل (یان بازنە) ی ڕەنگ. بۆ نموونە سوور، شین، لەگەڵ زەرد. ئەم ڕەنگانەش بە پلە دیاری دەکرێن (سفر بۆ 360 پلە)، مەبەست لەم پلەیەش شوێنی ڕەنگەکەیە لەسەر ویلی ڕەنگەکان.

S واتە Saturation، واتە چڕی یاخود هێزی ڕەنگ. ئەم نرخەش یەکسانە بە ڕێژەی سەدی ڕەنگەکە بەرامبەر بە ڕێژەی ڕەنگی ڕەساسی تێیدا. ڕەنگی پاك کە ڕەساسی تێدا نەبێت ئەوا چڕییەکەی لەسەدا سەدە. ڕەنگی ڕەساسی پاکیش چڕییەکەی لەسەدا سفرە. ڕەنگە چڕەکان لە لێوارەکانی ویلی ڕەنگدان، هەتا بەرەو چەقی ویلەکە بڕۆیت چڕی کەم دەبێتەوە.




مەبەست لە B بریتییە لە Brightness، واتە ڕووناکی و تاریکی ڕەنگەکە. نرخەکەشی بە ڕێژەی سەدی دیاری دەکرێت، لە سەدا سفر واتە ڕەش، لە سەدا سەد واتە سپی.

## مۆدێلی CIE Lab

مۆدێلی CIE L*a*b پشت دەبەستێت بە شێوازی دەركەوتنی ڕەنگەكان بۆ چاوەكانی مرۆڤ. نرخەكانی Lab هەموو ئەو ڕەنگانە دەنوێنن كە كەسێك بە چاوێكی ئاساییەوە ئەتوانێت بیان بینێت. ئەم مۆدێلە مۆدێلێكی پێشكەوتووە و باسكردنی قسەی زۆری ئەوێت، پاشان تا چەند ملیۆن ساڵێكی تر لە كوردستاندا پێویستت پێی نابێت، لەبەر ئەوە پێویست ناكات لێرەدا باسی بكەین.

## هەڵبژاردنی مۆدێلێكی ڕەنگ

ئێمە پێشنیار دەكەین كە تۆ ئیشەكەت لە RGB دا ئەنجام بدەیت، بەبێ گوێدانە ئەوەی ئایا وێنەكەت پرنت دەكرێت یاخود لە ئینتەرنێتدا بەكاردێت. لەبەر ئەوەی كە تەنانەت ئەگەر CMYK بەكاربێنیت، مۆنیتەرەكەت تەنها ئەتوانێت RGB پیشان بدات، چونكە پیكسێلی cyan و magenta و yellow ی نییە، بەڵكو كۆمپیوتەرەكەت زانیارییەكەی CMYK وەردەگێڕێت بۆ RGB، پاشان پیشانی دەدات. لەجیاتی ئەوەی كۆمپیوتەركەت مەجبوور بكەیت هەموو جارێك كە گۆڕانكارییەك لە وێنەكەدا دەكەیت ئەم وەرگێڕانە ئەنجام بدات، یەكەمجار لە RGB دا كار بكە و لە كۆتاییدا بیگۆڕە بۆ CMYK. سەرەڕای ئەمە، تۆ پێویستت بەوە نییە كە CMYK بەكاربێنیت ئەگەر پرنتەرێكی ملەوەنت هەیە لەماڵەوە، چونكە ئەو پرنتەرانەی لە ماڵەوەدا بەكاردێن بەشێوەیەك دروست كراون كە لەگەڵ RGB دا بە چاكی كاربكەن. تەنها لە كاتێكدا CMYK بەكاربێنە كە وێنەكەت دەنێریت بۆ چاپكردن لە موختەبەرێكدا، یان بەرگی كتێب و گۆڤار دروست دەكەیت (كە بە هۆی پرنتەری گەورەی تایبەتەوە چاپ دەكرێن).

## لە مۆدێلەوە بۆ مۆد

مۆدێلەكان، كە پێشتر باسمان كردن، پێناسەی ڕەنگەكان دەكەن. بەڵام مۆدەكان بریتین لە ڕێگای جیاواز بۆ كاركردن لەگەڵ ڕەنگەكاندا بە پشت بەستن بە مۆدێلەكان.

بۆ بینینی مۆدەكانی فۆتۆشۆپ، لە مێنیوی Image دا ماوسەكەت لەسەر Mode بووەستێنە.




سێ مۆد هەن كە تۆ زۆر بەكاریان دێنیت: Grayscale، RGB لەگەڵ CMYK.

## Bitmap و Grayscale



سەرەتا باسی مۆدە سەرەتاییەکان ئەکەین کە ئەتوانیت لە فۆتۆشۆپدا بەکاریان بێنیت، Bitmap و Grayscale.
مۆدی Grayscale 256 ڕەنگی ڕەساسیت پێ ئەدات، لە سپییەوە بۆ ڕەش. بەڵام Bitmap تەنها دوو ڕەنگت پێ ئەدات، سپی و ڕەش.
وێنەیەك بە مۆدی Grayscale:

هەمان وێنە بە Bitmap:



تێبینی بکە چەندە جیاوازن لە کوالیتی (Quality، واتە ڕوونی و جوانیی وێنەکە) دا.

کاتێك وێنەیەك ئامادە ئەکەیت بۆ ئەوەی بەکاری بێنیت لە شوێنێکدا کە بە ڕەش و سپی چاپ بکرێت (بۆ نموونە ڕۆژنامەیەکی ڕەش و سپی)، شتێکی باشە کە وێنەکەت بکەیت بە Grayscale. ئەمە ڕێگەت پێ ئەدات کە پێشبینی بکەیت وێنەکە دوای چاپکردن چۆن ئەردەکەوێت، پاشان ئەگەر پێویستی کرد وێنەکە ڕووناکتر یان تاریکتر بکەیت هتد.




بۆ گۆڕینی وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگ بۆ Grayscale، لە مێنیوی Image دا ماوسەکە لەسەر Mode بووەستێنە و کلیك لەسەر Grayscale بکە.




بۆ گۆڕینی وێنەیەك بۆ Bitmap بۆ
ـ ڕوستکردنی کاریگەرییەکی تایبەتی،
یەکەمجار وێنەکە بگۆڕە بۆ Grayscale
وەك لە سەرەوە باسمان کرد، پاشان لە
مێنیوی Image دا ماوسەکە لەسەر
Mode بووەستێنە و کلیك لەسەر
Bitmap بکە.

## RGB

مۆدی RGB ئەو مۆدەیە کە بەکاردێت لە کاتی ئیشکردن لەسەر وێنەیەك کە لەسەر شاشەیەکی کۆمپیوتەر پیشان دەدرێت. ئەگەر وێنە ئامادە دەکەیت بۆ ئەوەی لە پرێزێنتەیشنێکدا بەکاربێت، یاخود لە ڤیدیۆیەکدا، یان لاپەڕەیەکی ئینتەرنێت، ئەوا RGB بەکاربێنە بۆ دەستکەوتنی باشترین ڕەنگ.

## CMYK

وەك پێشتر فێربوویت، مۆدی CMYK ئەبێ تەنها کاتێك بەکاربێت کە وێنەکان بە پرنتەرێکی بازرگانی (وەك ئەوانەی لە خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەکاندا بەکاردەهێنرێن) چاپ بکرێن.

## گۆڕینی مۆدی ڕەنگەکان

وەك پێشتر باسمان کرد، بۆ گۆڕینی مۆد، لە مێنیوی Image دا ماوسەکەت لەسەر Mode بووەستێنە و پاشان کلیك لەسەر مۆدی خوازراو بکە. پێویستە ئەوەت لە بیر بێت کە کاتێك مۆدی وێنەکەت ئەگۆڕیت، ڕەنگەکانی ناو وێنەکە کەمێك گۆڕانکارییان بەسەر دێت، ئەگەر چەند جارێك مۆد بگۆڕێت ئەکرێت ئەنجامی کۆتایی زۆر جیاواز بێت لە وێنە ئەسڵییەکە. لەبەر ئەوە وا چاکترە کە پێش دەستکردن بە ئیش بزانیت ئەتەوێت ئەنجامی کۆتایی وێنەکەت چی بێت.

دووبارەی دەکەینەوە کە باشترین مۆد بۆ کارکردن بریتییە لە RGB، هەموو ئیشەکانت لە RGB دا بکە. پاشان کاتێك کە ویستت وێنەکە بنێریت بۆ شوێنێك بۆ ئەوەی بە پرنتەرێکی پێشکەوتوو پرنت بکرێت. مۆدی وێنەکە بگۆڕە بۆ CMYK.

# بەشی شەشەم

# یـــاریکردن بــــە ڕەنگەکــــــان

## ڕاستکردنەوەی ڕەنگ




فۆتۆشۆپ سێتێکی تەواوی ئامڕازت دەخاتە بەردەست بۆ دەستکاری کردنی لایەنە جیاوازەکانی ڕەنگی وێنەکانت. ئەم ئامڕازانە لە سەبمێنیو (واتە مێنیویەك لە ناو مێنیویەکی تر)ی Adjustments ی مێنیوی Image دان.

## دیاریکردنی پێویستییەکانت بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەنگ

پێش ئەوەی دەست بکەیت بە دەستکاریکردنی ڕەنگ، پێویستە دیاری بکەیت کە چ جۆرە ڕەنگێکت هەیە لە وێنەکەدا ئەتەوێت لە کۆتاییدا وێنەکەت بۆ چ مەبەستێك بەکاربێنیت. پێشتر فێری ئەوە بوویت کە ڕەنگی RGB ئەو ڕەنگەیە کە شاشەی کۆمپیوتەرەکان بەکاری دەهێنن و ڕەنگی CMYK ئەو ڕەنگەیە کە پرنت دەکرێت. ئەگەر وێنەکەت بۆ ئینتەرنێتە، لە RGB دا کار بکە و بەپێی پێویستە سیفاتی ڕەنگی وێنەکە بگۆڕە. ئەگەر وێنەکەت بۆ پرنتکردنە بە ئامێرێکی پرنتکردنی بازرگانی گەورە، سەرەتا بە RGB کار بکە، پاشان لە کۆتاییدا وێنەکەت بگۆڕە بۆ CMYK و ئەگەر پێویستی کرد گۆڕانکاری ئەنجام بدە. ئەگەر وێنەکەت بۆ پرنتکردنە بە پرنتەرێکی ڕەنگاوڕەنگی ئاسایی، ئەوا هەر بە RGB کار بکە، چونکە RGB باشترین ئەنجام دەدات بەدەستەوە لەم پرنتەرانەدا. ئەگەر وێنەکەت بۆ پرنتکردنە بە پرنتەرێکی ڕەش و سپی، پێویست ناکات هەوڵ بدەت ڕەنگی شینی ئاسمانەکە جوانتر بکەیت، وێنەکەت بگۆڕە بۆ Grayscale و پاشان تەماشای وێنەکە بکە و دیاری بکە چ گۆڕانکارییەك پێویستە.

## بەکارهێنانی Variations

یەکێك لە ڕێگا خێراکانی ڕاستکردنەوەی ڕەنگ بریتییە لە Variations، کە ڕێگەت پێ ئەدات وێنە ئەسڵییەکە ببینیت لەگەڵ هەمان وێنە کە بە چەند جۆرێك گۆڕانکاری تێدا کراوە.

بۆ بەکارهێنانی Variations:

1. لە مێنیوی Image دا ماوسەکە لەسەر Adjustments بووەستێنە و کلیك لەسەر Variations بکە بکە لە خوارەوەی سەبمێنیووەکەدایە.




2- کلیك لەسەر یەکێك لەم چوار هەڵبژاردنە بۆ ئەوەی گۆڕانکاری تێدا بکەیت:

- Shadows: ناوچە تاریکەکان.
- Midtones: ناوچە ناوەندەکان (نێوان تاریك و ڕووناك).
- Highlights: ناوچە ڕووناکەکان.
- Saturation: هەر سێ هەڵبژاردنەکەی سەرەوە پێکەوە.

سوودی ئەم هەڵبژاردنانە ئەوەیە کە ئەتوانیت بەشێوەیەکی دیاریکراو گۆڕانکاری لە ناوچە تاریکەکاندا بکەیت، پاشان بە شێوەیەکی تر گۆڕانکاری لە ناوچە ڕووناکەکاندا بکەیت.



3. ئەم دیارخەرە بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی بەهێزیی کاریگەریی کردارەکە لەسەر وێنەکان.




4. دوای کلیك کردن لەسەر وێنەیەك، ئەتوانیت کلیك لەسەر وێنەیەکی تر بکەیت بۆ ئەوەی گۆڕانکارییەکی تر لەسەر وێنەکە ئەنجام بدەیت.




5. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی گۆڕانکارییەکان، یاخود کلیك لەسەر Cancel بکە بۆ گەڕانەوە بۆ وێنەکە بەبێ ئەنجامدانی گۆڕانکاری.



## ڕاستکردنەوەی ڕووناکی

کاتێك کە ڕەنگەکانی وێنەکەت تەواون، بەڵام وێنەکە تاریکە، دەستکاریکردنی دەستی ڕووناکی ئەکرێت کێشەکەت چارەسەر بکات. ئەم هەنگاوانە بەکاربێنە:




1. لە لیستی Image دا ماوسەکە لەسەر Adjustments بووەستێنە و کلیك لەسەر Levels بکە.

(یاخود Ctrl+L بکە)




2. دڵنیابکەرەوە لەوەی کە بۆکسی Preview چێك کراوە (ئیشارەتی لێدراوە) بۆ ئەوەی کاتێك ڕووناکی وێنەکە دەگۆڕیت ڕاستەوخۆ گۆڕانەکە لە وێنەکەدا ببینیت.




3. ڕووناکی وێنەکە بگۆڕە بەهۆی ڕاکێشانی سێ سلایدەری ناوچەی Input Levels. سلایدەری ڕەش پێویستە لە لای چەپی ویندۆکەوە بێت لە ئەو شوێنەدا کە شەپۆلە ڕەشەکان دەست دەکەن بە بەرز بوونەوە. سلایدەری سپی دەبێت لە لای ڕاستی وێنەکەوە بێت لە ئەو شوێنەدا کە شەپۆلە ڕشەکان لە نزمترین ئاستدان. پێویستە سلایدەری ناوەڕاست بجووڵێنیت و تەماشای وێنەکە بکەیت بۆ دۆزینەوەی باشترین ئەنجام.




4. بۆ ڕاستکردنەوەی کۆنتراستی وێنەکە (واتە ڕێژەی جیاوازی نێوان ناوچە تاریکەکان و ناوچە ڕووناکەکان)، دوو سلایدەری بەشی Output Levels بەکاربێنە.
5. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.




## بەکارهێنانی دایەلۆگ بۆکسی کەلەر بالآنس Color Balance

هەموو ڕەنگێك لەسەر ویلی ڕەنگ (کە پێشتر باسمان کرد) پێچەوانەیەکی هەیە. پێچەوانەی ڕەنگی سوور ڕەنگی سیان (Cyan) ە، پێچەوانەی سەوز ڕەنگی ماجێنتا (magenta) ە، پێچەوانەی زەردیش شینە. کاتێك دایەلۆگ بۆکسی Color Balance بەکاردێنیت بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەنگەکانی وێنەیەك، ڕەنگێك زیاد دەبێت و ڕەنگە پێچەوانەکەی کەم دەبێتەوە. بە زیاد کردنی زەرد ڕەنگی شین کەم دەبێتەوە.




بۆ بەکارهێنانی دایەلۆگ بۆکسی Color Balance:

1. لە لیستی Image دا ماوسەکەت لەسەر Adjustments بووەستێنە و کلیك لەسەر Color Balance بکە. یاخود Ctrl+B بکە.
2. لێرەدا ئەو جۆرە ڕەنگانە دیاری بکە کە ئەتەوێت گۆڕانکارییان تێدا بکەیت، ئەم جۆرانەش لە بابەتی Variations دا (چەند لاپەڕەیەك پێشتر) باس کران.

3. ئیشارەت لە بۆکسی Preserve Luminosity بدە ئەگەر ویستت ئاستی ڕووناکی و تاریکی وێنەکەت (brightness) گۆڕانکاری بەسەردا نەیەت کاتێك ڕەنگەکان دەگۆڕیت. بەڵام ئەگەر گرنگ نییە کە ئاستی ڕووناکی بگۆڕێت ئەوا ئیشارەتی لێ مەدە.




4. ئەم سێ سلایدەرە بجووڵێنە و تەماشای وێنەکەت بکە بۆ بینینی ئەنجامی ئیشەکەت (پێویستە بۆکسی Preview ئیشارەتی لێ درابێت بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ ئەنجامی ئیشەکەت ببینیت).




5. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.

## ڕاستکردنەوەی ڕەنگ بە بەکارهێنانی دایەلۆگ بۆکسی Hue/Saturation

دایەلۆگ بۆکسی Hue/Saturation ئامرازێکی زۆر بەهێزە کە ڕێگەت پێ ئەدات ڕەنگەکانی ناو وێنەیەك، لەگەڵ تۆخی و کاڵی، لەگەڵ تاریکی و ڕووناکی گشتی وێنەکە دەستکاری بکەیت. لە خوارەوەدا باسی چۆنێتی بەکارهێنانی ئەم ئامرازە دەکەین:




1. لە لیستی Image دا ماوسەکە لەسەر Adjustments بوەستێنە و کلیك لەسەر Hue/Saturation بکە. یاخود Ctrl+U بکە.




2. لە لیستی Edit دا ئەگەر Master هەڵبژێریت ئەوا گۆڕانکارییەکان لەسەر هەموو ڕەنگەکانی ناو وێنەکە ئەنجام ئەدرێت، واتە تۆ ئیش لەسەر وێنەکە هەمووی دەکەیت، بەڵام ئەتوانیت ڕەنگێکی تایبەت هەڵبژێریت وەك سوور (Red) بۆ ئەوەی تەنها ئیش لەسەر ئەو ڕەنگە بکەیت.




3. پێشتر باسی Hue، Saturation لەگەڵ Lightness (کە هاو واتایە لەگەڵ Brightness) مان کرد. سلایدەرەکان بجووڵێنە و تەماشای کاریگەرییەکە بکە لەسەر وێنەکەت.




4. هەروەها ئەتوانیت بەراوردی گۆڕانی ڕەنگەکان بکەیت بە تەماشاکردنی ئەم دوو هێڵە ڕەنگاوڕەنگە. هێڵی سەرەوە ڕەنگی ئەسڵیی وێنەکەیە و هێڵی خوارەوە ڕەنگی وێنەکەیە دوای گۆڕانکاری.

5. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.



# ڕاستکردنەوەی ڕووناکی و کۆنتراست بە بەکارهێنانی دایەلۆگ بۆکسی Brightness/Contrast

کۆنتراست (وەك پێشتر باسمان لێ کردووە) واتە ڕێژەی جیاوازی نێوان ناوچە ڕووناکەکان و ناوچە تاریکەکان. کۆنتراستی زۆر ناوچەیەکی وێنەکە زۆر تاریك و ناوچەیەکی وێنەکە زۆر ڕووناك دەکات، وەك نموونەکەی خوارەوە:



کۆنتراستی کەمیش جیاوازی نێوان ناوچە تاریك و ڕووناکەکان کەم دەکاتەوە:

بۆ بەکارهێنانی دایەلۆگ بۆکسی Brightness/Contrast شوێن هەنگاوەکانی خوارەوە بکەڤە:




1. لە لیستی Image دا ماوسەکە لەسەر Adjustments بووەستێنە و کلیك لەسەر Brightness/Contrast بکە.
2. لە دایەلۆگ بۆکسی Brightness/Contrast دا بە جوولاندنی سلایدەرەکان بۆ لای ڕاست وێنەکە ڕووناکتر دەبێت یان کۆنتراست زیاد دەبێت، بە پێچەوانەشەوە بە جوولاندنی سلایدەرەکان بۆ لای چەپ وێنەکە تاریکتر دەبێت یان کۆنتراست کەم دەبێتەوە.




3. لە ڕابردوودا ئیشی ئەم دایەلۆگ بۆکسە جیاواز بوو، بۆ بەکارهێنانی دایەلۆگ بۆکسە کۆنەکە ئیشارەت لە بۆکسی Use Legacy بدە و پاشان سلایدەرەکان بجوولێنە بۆ ئەوەی جیاوازییەکە ببینیت.
4. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکارییەکان. یاخود Cancel بۆ گەڕانەوە بۆ سەر وێنەکەت بەبێ ئەوەی گۆڕانکارییەکانی لەسەر ئەنجام بدرێت.

## ڕاستکردنەوەی سێبەر و هایلایەتکان




یەکێك لە شتە بەهێزەکانی ناو فۆتۆشۆپ بریتییە لە دایەلۆگ بۆکسی Shadow/Highlights. ئەم دایەلۆگ بۆکسە ڕێگەت پێ ئەدات کۆنترۆڵی بڕی سێبەر و هایلایت (ناوچەی ڕووناك) بکەیت لە وێنەیەکدا بەبێ گۆڕینی کۆنتراست.

بۆ کردنەوەی ئەم دایەلۆگ بۆکسە لە لیستی Image دا ماوسەکەت لەسەر Adjustments بووەستێنە و کلیك لەسەر Shadow/Highlight بکە.




دایەلۆگ بۆکسەکەی خوارەوەت بۆ دەکرێتەوە:




ئیشارەت لە بۆکسی Show More Options بدە بۆ پیشاندانی بەشەکانی تری دایەلۆگ بۆکسەکە:



دایەلۆگ بۆکسەکە دەگۆڕێت بۆ شێوەکەی خوارەوە. سلایدەرەکان بجووڵێنە و تەماشای ئەنجامەکە بکە لە وێنەکەدا. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.




## بەکارهێنانی Photo Filter




وێنەگر هەندێك جار فلتەرێك کە ڕەنگێکی دیاری کراوی هەیە دەخاتە سەر عەدەسەی کامێراکەی بۆ ئەوەی کاریگەرییەکی تایبەت دروست بکات. لە فۆتۆشۆپدا ئەتوانیت ئەم کردارە بەسەر هەموو وێنەکانتدا ئەنجام بدەیت بە بەکارهێنانی دایەلۆگ بۆکسی Photo Filter. بۆ کردنەوەی ئەم دایەلۆگ بۆکسە لە لیستی Image دا ماوسەکەت لەسەر Adjustments بووەستێنە و کلیك لەسەر Photo Filter بکە. دایەلۆگ بۆکسی Photo Filter دەکرێتەوە. لە لیستی Filter دا ڕەنگێك هەڵبژێرە بۆ بەکارهێنانی وەکو فلتەر.




یاخود کلیك لەسەر چوارگۆشەی Color بکە و ڕەنگێك هەڵبژێرە.




ئەگەر ئەم بۆکسە نیشارەتی لێ نەدرابێت ئەوا فۆتۆشۆپ گرنگی نادات بە ئاستی ڕووناکی وێنەکە و لە کاتی دانانی فلتەری تاریکدا وێنەکەش تاریك دەبێت. بەڵام ئەگەر نیشارەتی لێ درابێت ئەوا فۆتۆشۆپ نایەڵێت ئاستی ڕووناکی وێنەکە گۆڕانی زۆری بەسەردا بێت.






ئەم سلایدەرە دیاری دەکات کە فلتەرەکە کاریگەرییەکەی بەهێز بێت یان لاواز.



## بەکارهێنانی لایەر لە ڕاستکردنەوەی ڕەنگدا

لایەر، کە بە مانای چین یان توێژ دێت، بریتییە لە بەشێکی گرنگی فۆتۆشۆپ. لە داهاتوودا بە چڕی باسی لایەر دەکەین، بەڵام ئێستا ئەوەی پێویستە بیزانیت ئەوەیە کە لایەر وەك شوشەیەك وایە ئەتوانیت لەسەر وێنەکەت دایبنێیت و بە خواستی خۆت بۆیەی بکەیت، هەر کاتێکیش ویستت ئەتوانیت شووشەکە لا ببەیت و وێنە ئەسڵییەکەت دەستبخەیتەوە.

بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەنگ بە دانانی لایەرێکی ڕاستکردنەوە، هەنگاوەکانی خوارەوە بەکاربێنە:

1. لە مێنیوی Layer دا ماوسەکەت لەسەر New Adjustment Layer بووەستێنە، پاشان کلیك لەسەر ئەو ڕاستکردنەوەیە بکە کە ئەتەوێت ئەنجامی بدەیت.




2. دایەلۆگ بۆکسێك دەکرێتەوە. کلیك لەسەر OK بکە.






3. دایەلۆگ بۆکسی ڕاستکردنەوەکە دەکرێتەوە. بە خواستی خۆت ئیش لەسەر وێنەکەت بکە. دواتر ئەتوانیت وێنەکەت خەزن بکەیت و دابخەیتەوە.

4. کاتێکی تر کە وێنەکەت ئەکەیتەوە، ئەتوانیت هەموو ئەو ڕاستکردنەوانە بسڕیتەوە کە پێشتر ئەنجامت دان. بۆ سڕینەوەی ڕاستکردنەوەکان، کلیك لەسەر پالیتی لایەر بکە.




5. لە پالیتی لایەردا، کلیکی ڕاست لەسەر ئەو لایەرە بکە کە ناوی ئەو گۆڕانکارییەی لەسەر نووسراوە کە تۆ ئەنجامت داوە لەسەر وێنەکە، بۆ نموونە ئەگەر Color Balance ت بەکارهێنابێت بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەنگی وێنەکە، ئەوا لایەرەکە ناوی Color Balance دەبێت.




6. کلیك لەسەر Delete Layer بکە.

ئێستا کە لایەرەکەت سڕیوەتەوە وێنەکە دەگەڕێتەوە بۆ باری ئاسایی خۆی.

# بەشی حەوتەم




# بۆیەکردن بە فڵچە

## مێنیوی فڵچەکان

پێش ئەوەی باسی فڵچەیەکی دیاریکراو بکەین، تەماشایەکی مێنیوی فڵچەکان بکە.
سەرەتا، ئامرازێکی فڵچە هەڵبژێرە، بۆ نموونە ئامرازی برەش Brush.




پاشان کلیك لەسەر ئەم سەهمە بکە کە لە خوارەوەدا دیاریمان کردووە.




ئێستا لیستی فڵچەکانت بۆ دەکرێتەوە.




ئەتوانیت کلیك لەسەر یەکێك لە فڵچەکانی ناو لیستەکە بکەیت و بەکاری بێنیت. ئەگەر فڵچەی کەمت بینی، کلیك لەسەر ئەم سەهمە بکە:




پاشان لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Brushes بکە:




## پالیتی فڵچەکان

ئامرازێکی فڵچە هەڵبژێرە وەك لە بابەتی پێشوودا باسمان کرد، پاشان کلیك لەسەر دوگمی پالیتی فڵچەکان بکە لە لای ڕاستی ویندۆی فۆتۆشۆپدا (یاخود پەنجە بە کلیلی F5 دا بنێ).




ئەتوانیت پالیتەکە ڕابکێشیت و لێی بکەیتەوە بە کلیك کردن لەسەر ئەم ناوچەیەوە و ڕاکێشانی ماوسەکە.




ستوونەکەی لای چەپ کۆمەڵێك سیفاتی فڵچەکەی تێدایە، لەگەڵ شێوەی فڵچەکە. بە کلیك کردن لە سەر هەر یەکێکیان، هەڵبژاردنی تایبەت بە ئەو سیفەتەمان پیشان دەدرێت لە لای ڕاستدا.دوو سیفاتی گرنگی فڵچەکەت بریتین لە قەبارە و شێوە. بۆ دیاریکردنی قەبارەی فڵچەکەت و گۆڕینی شێوەکەی و چەند سیفەتێکی تر، هەنگاوەکانی خوارەوە بەکاربێنە:




1. کلیك لەسەر Brush Presets بکە.




2. بۆ دیاریکردنی شێوەی سەری فڵچەکە، کلیك لەسەر یەکێك لە شێوەکان بکە لێرەدا.




3. بۆ گەورەکردنی قەبارەی فڵچەکە، ئەم سلایدەرە ڕابکێشە بۆ لای ڕاست. بۆ بچووککردنەوەی قەبارەی فڵچەکە، سلایدەرەکە ڕابکێشە بۆ لای چەپ.

4. ئێستاش کاتی دیاریکردنی سیفەتێکی ترە کە پێی دەوترێت هاردنێس (Hardness، واتە ڕەقی). ئەگەر هاردنێسی فڵچەکە کەم بێت، سنووری ئەو هێڵانەی کە پێی دروست دەکەیت لێڵ و تەماوین، وەك وێنەکەی خوارەوە:





بەڵام ئەگەر هاردنێس لەسەدا سەد بێت، هێڵەکان وەك خوارەوە دەردەچن:




بۆ دیاریکردنی هاردنێس، وەك لە وێنەکەی خوارەوەدا دیارە، سلایدەرەکە بجووڵێنە و تەماشای نموونەکە بکە لە خوارەوەی ویندۆکەدا:



Spacing (سپەیسنینگ) واتە دانانی بۆشایی. ئەگەر دانانی بۆشایی زۆربێت، هێڵەکە وەك خوارەوەی لێ دێت:




بۆ گۆڕینی ئاستی دانانی بۆشایی، سلایدەرەکەی خوارەوە بجووڵێنە.






دوای ئەوەی فڵچەیەك دروست دەكەیت كە بەدڵتە، ئەتوانیت خەزنی بكەیت. بۆ خەزنكردن هەنگاوەكانی خوارەوە بەكاربێنە:

1. كلیك لێرە بكە، لیستێكت بۆ دەكرێتەوە.

2. لە لیستەكەدا كلیك لەسەر New Brush Preset بكە.







3. دایەلۆگ بۆكسی Brush Name دەكرێتەوە، لێرەدا ناوێك بۆ فڵچەكەت بنووسە بۆ ئەوەی دواتر بتوانیت بیناسیتەوە.




4. كلیك لەسەر OK بكە.

ئێستا فڵچەكەت خەزن بووە.






سوای خەزنكردنی فڵچەكەت لەوانەیە بپرسیت ئایا ئەگەر لە داهاتوودا ئیشم پێی بوو چۆن بەكاری بێنم؟ خەمت نەبێت، ئەوا ئەوەشت بۆ باس دەكەین:

1. كلیك لەسەر تابی Brush Presets بكە بۆ ئەوەی بچیتە ناوچەی فڵچە خەزنكراوەكانەوە.




2. وەك لە وێنەكەی سەرەوەدا دیارە، كۆمەڵێكی زۆر فڵچە پیشاندراون بەبێ پیشاندانی ناوەكانیان، لەبەر ئەمە لەوانەیە سەخت بێت كە فڵچەیەكی دیاریكراو بناسیتەوە ئەگەر فڵچەی زۆر خەزن بكەیت. بۆیە ئێستا شێوەی لیستەكە دەگۆڕین بۆ ئەوەی ناوی فڵچەكانمان پیشان بدات. سەرەتا كلیك لێرە بكە.




3. كلیك لەسەر Large List بكە.






4. ئێستا فڵچەکان بە گەورەیی دەردەکەون و ناوەکانیان لە تەنیشتیانەوە دەنووسرێت. تەماشای لیستەکە بکە، دوا فڵچە کە تۆ خەزنت کردبێت دەچێتە کۆتایی لیستەکەوە. بۆ بەکارهێنانی کلیکی لەسەر بکە.




## بەکارهێنانی سلایدرەی Opacity

گرنگترین ئامرازی کۆنترۆڵکردن لە ئۆپشنزبارِدا بریتییە لە ئەو سلایدەرەی کە شەفافیەتی بۆیەی فڵچەکە دیاری دەکات. بۆ گۆڕینی شەفافیەت، سەرەتا کلیك لەسەر سەهمی تەنیشت بۆکسی Opacity بکە:

پاشان سلایدەرەکە بجووڵێنە بۆ کەم یان زیادکردنی ئۆپاسیتی (Opacity، پێچەوانەی شەفافیەتە)، واتە ئاستی ڕێگەگرتنی مادەیەك لە تێپەڕبوونی تیشك پیایدا. بەپێچەوانەوە، شەفافیەت واتە ئاستی ڕێگەپێدانی مادەیەك بۆ تێپەڕبوونی تیشك پیایدا. لە فۆتۆشۆپدا شەفافیەت بەکارنایەت، بەڵکو ئۆپاسیتی بەکاردێت، ئەنجامەکەشی ئەوەیە کە بۆ زیادکردنی شەفافیەتی بابەتێك، ئاستی ئۆپاسیتی کەم دەکەیتەوە. ئەگەر ئۆپاسیتی بابەتێك 100% بێت ئەوا ئەو بابەت هیچ شەفافیەتی نابێت.



بۆ تێگەشتنی زیاتر لە ئۆپاسیتی، تەماشای وێنەکەی خوارەوە بکە.




دوو جۆر هێڵ مان هەیە، کە سەرەتا (لە لای ڕاستدا) ئۆپاسیتییان لەسەدا سەدە. پاشان چەند جارێك ئۆپاسیتیمانیان کەم کردووەتەوە. تەماشای لای چەپ بکە، هێڵەکان ئۆپاسیتییان لەسەدا 25 ە، کە ئەوە دەگەیەنێت کە زۆر شەفافن و بابەتەکانی پشتیانەوە بە ڕوونی تیایاندا دەردەکەون.

## بەکارهێنانی هەڵبژاردنی لێواری تەڕ Wet Edges

لێواری تەڕ کاریگەرییەکی تایبەت دەبەخشێت بە فڵچەکەت کاتێك ڕەنگی پێ دەکەیت، وای لێ دەکات شێوازی بۆیەکردنی وەك بۆیەکردنی فڵچەیەکی ڕاستەقینەبێت کاتێك بۆیەی ئاوی بەکاردێنیت.



کاتێك لە فۆتۆشۆپدا بە فڵچەیەکی ئاسایی ڕەنگ دەکەیت (بەبێ بەکارهێنانی لێواری تەڕ)، کاتێك پەنجە لەسەر ماوسەکەت هەڵدەگریت و دووبارە دەست دەکەیتەوە بە ڕەنگ کردن، ئەگەر فڵچەکە دووبارە بهێنیتەوە بە ناوچەیەك کە پێشتر ڕەنگت کردبێت، ئەوا هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، واتە گرنگ نییە چەند جار فڵچەکە دێنیت بە ناوچەیەکدا، ڕەنگەکە تۆختر نابێتەوە.

تەماشای وێنەکەی خوارەوە بکە، بەبێ بەکارهێنانی لێواری تەڕ کۆمەڵێك هێڵی یەکتربڕمان دروستکردووە، واتە بەسەریەکدا ڕۆشتوون. دەبینیت کە بابەتەکە هەمووی یەك ڕەنگی هەیە.



بەڵام بە بەکارهێنانی لێواری تەڕ، دووبارە چەند هێڵێکی یەکتربڕمان دروستکردووە. تەماشای ئەنجامەکە بکە.

دەبینیت کە لە ناوەڕاستی وێنەکەدا، لە ئەو ناوچانەدا کە هێڵەکان بەسەریەکدا ڕۆشتوون، ڕەنگی هێڵەکان تۆخترە.



بۆ بەکارهێنانی لێواری تەڕ، لە پالیتی فڵچەکاندا ئیشارەت لە بۆکسی Wed Edges بدە.

## بەکارهێنانی ئێربڕەش Airbrush



ئامرازی ئێربڕەش وەك سپرای وایە، کە لەجیاتی فڵچەکەکردن، بۆیەکە لە دوورەوە بە پەستانی هەوا هەڵدەدات بۆ سەر ئەو بابەتەی ڕەنگ دەکرێت.
بۆ بەکارهێنانی ئێربڕەش، لە کاتی بەکارهێنانی فڵچەیەکی ئاساییدا کلیك لەسەر دوگمەی ئێربڕەش بکە لە ئۆپشنزباڕدا.



کاتێك کە ئێربڕەش هەڵدەبژێریت، هەتا ماوەیەکی زیاتر پەنجە لەسەر ماوسەکەت دابنێیت، ڕەنگی زیاتر بەر ئەو ناوچەیە دەکەوێت و تۆخ تر دەبێتەوە.
بۆ بەکارهێنانی فڵچەیەکی هەوایی ئامادەکراو کە زۆر لە ڕاستییەوە نزیکە، لە لیستی فڵچەکاندا کلیك لەسەر Spray Can بکە. بۆ بیرکەوتنەوەی چۆنێتی کردنەوەی لیستی فڵچەکان ئەتوانیت تەماشای لاپەڕەی یەکەم و دووەمی ئەم بەشە بکەیت.



## ئامرازی بڕەش Brush

پێشتر باسی ئامرازی بڕەشمان کرد. لێرەدا چەند شتێکی تر دەربارەی ئەم ئامرازە گرنگەت فێر دەکەین.

لە تووڵبۆکسەکەدا کلیك لەسەر ئامرازی بڕەش بکە بۆ بەکارهێنانی ئامرازەکە.



شێوەی ئامرازی بڕەش لە کاتی وێنەکێشاندا بازنەیەکە کە قەبارەی دەمی فڵچەکە پیشان دەدات:



بۆ گۆڕینی شێوەی فڵچەکە، پەنجە بە کلیلی Caps Lock دا بنێ لەسەر کیبۆردەکەت. شێوەی فڵچەکە دەگۆڕێت بۆ شێوەکەی خوارەوە:

شێوازی ئیشکردنی فڵچەکە ناگۆڕێت، تەنها دیمەنی دەرەوەی فڵچەکە دەگۆڕێت.



بۆ کێشانی هێڵێکی ڕاست، لە کاتی دروستکردنی هێڵەکەدا پەنجە لەسەر کلیلی Shift دابنێ. فۆتۆشۆپ بەبێ ئەوەی گوێ بداتە لەرزینی دەستت، هێڵەکەت بە شێوەیەکی ڕاست بۆ دەکێشێت.

لە وێنەکەی خوارەوەدا سەهمەکە ئاڕاستەی جووڵەی فڵچەکە پیشان دەدات، لەسەرەوەدا هێڵێکی ڕاستمان بۆ دەرچووە، واتە خواربوونەوەی تیادا نییە.



## ئامرازی گۆڕینەوەی ڕەنگ

ئەم ئامرازە ئامرازێکی زۆر بەسوودە. ئیشکردنی وەك فڵچە وایە، کاتێك دەیهێنیت بە ناوچەیەکدا، ڕەنگەکانی ئەو ناوچەیە دەگۆڕێتەوە بە ئەو ڕەنگەی کە فڵچەکە بۆی هەڵبژێردراوە. بۆ نموونە کاتێك ئیش لەسەر وێنەیەك دەکەیت کە گوڵێکی زەردی تێدایە، ئەتوانیت بەهۆی ئەم ئامرازەوە ڕەنگی گوڵەکە بکەیت، ڕەنگەکەی بکەیت بە سوور، بەبێ ئەوەی دیمەنی گوڵەکە تێك بدەیت.

بۆ بەکارهێنانی ئەم ئامرازە شوێن هەنگاوەکانی خوارەوە بکەوە:

1. کلیکی ڕاست لەسەر ئامرازی Brush بکە.




2. کلیك لەسەر Color Replacement Tool بکە.




3. هەر وەك فڵچەیەکی ئاسایی ڕەنگی ئەو بابەتەی وێنەکەت بکە کە ئەتەوێت، لێرەدا ڕەنگی گوڵە شینەکە دەکەین و دەیگۆڕین بۆ گوڵێکی سوور.




4. بۆ وەرگرتنی ڕەنگی بابەتێکی ناو وێنەکەت، پەنجە بە کلیلی Alt دا بنێ و کلیك لەسەر ئەو شوێنە بکە کە ئەتەوێت ڕەنگەکەی لێ وەربگریت، بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت گوڵەکە ڕەنگ بکەین بە هەمان ڕەنگی ئەو دەستەی کە گوڵەکەی هەڵگرتووە، پەنجە لەسەر Alt دادەنێین و کلیك لەسەر شوێنێکی پەنجەکان دەکەین.
5. ئێستا ئەتوانیت دەست بکەیتەوە بە ڕەنگکردن. فڵچەکەت ئەو ڕەنگە بەکاردێنێت کە لە هەنگاوی (4) دا هەڵتبژارد.




## ئامڕازی سڕینەوە Eraser

ئەم ئامڕازە وەك لە ناوەکەیەوە دیارە، ئیشی سڕینەوەیە. بۆ بەکارهێنانی ئەم ئامڕازە، کلیك لەسەر ئایکۆنی ئامڕازی سڕینەوە بکە لە گروپی فڵچەکاندا.




ئەتوانیت کلیك لەسەر کلیلی E بکەیت بۆ هەڵبژاردنی ئەم ئامرازە.
بۆ گۆڕینی ڕووبەری ئامرازەکە و هەر تایبەتمەندێتییەکی تر، وەك بۆ هەموو فلچەکانی تر، ئۆپشنزباڕ بەکاربێنە

## ئامرازی سڕینەوەی باکگراوند Background Eraser




ئەم ئامرازە کاتێك سوودی هەیە کە بتەوێت ئۆبجێکتێك لە وێنەیەك وەربگریت، بۆ نموونە پەرداخێك یان کوپێك، پاشان لە وێنەیەکی تردا دایبنێیتەوە. ئەم ئامرازە ڕێگەت پێ ئەدات بابەتەکانی دەوروبەری ئۆبجێکتەکە بسڕیتەوە، بە باکگراوندەکەشەوە، واتە کاتێك شتێك ئەسڕیتەوە شوێنەکەی سپی نابێت، بەڵکو دەبێت بە شوێنێك کە هیچ ڕەنگێکی نییە، بۆ ئەوەی کە ئۆبجێکتەکەت ڕاکێشایە ناو وێنەیەکی ترەوە، تەنها ئۆبجێکتەکە بچێتە ناو وێنەکە، نەك بە چوارچێوەیەکی گەورەی سپییەوە.
بە سادەیی، ئامرازی سڕینەوەی باکگراوند بەکاردێت بۆ سڕینەوەی باکگراوند.

تەماشای نموونەکەی خوارەوە بکە، ئێمە بە وریاییەوە زۆربەی باکگراوندی دەوروبەری پەرداخەکەمان سڕیوەتەوە. چوارگۆشە ڕەساسی و سپییەکان ئەوە دەگەیەنن کە ئەو ناوچەیە هیچ ڕەنگێکی تێدا نییە، واتە شەفافە و حسابی بۆ ناکرێت. ئێستا ئەتوانین ئەم وێنەیە بخەینە ناو چیمەنێکەوە، چیمەنەکە تەنانەت لە دەسکی پەرداخەکەوە دەردەکەوێت، چونکە ئەو ناوچەیەشمان سڕیوەتەوە بە بەکارهێنانی ئامرازی سڕینەوەی باکگراوند.

بۆ بەکارهێنانی ئامرازی سڕینەوەی باکگراوند هەنگاوەکانی خوارەوە بەکاربێنە.

1. کلیکی ڕاست لەسەر ئامرازی سڕینەوەی ئاسایی بکە.



2. کلیك لەسەر Background Eraser Tool بکە.




3. وەك ئامرازی سڕینەوەی ئاسایی ئەو شوێنانە بسڕەرەوە کە ئەتەوێت.

## ئامرازی سڕینەوەی سیحری

# Magic Eraser

ئەم ئامرازە وەك ئامرازی سڕینەوەی باکگراوند، باکگراوندی وێنەکەت بۆ دەسڕێتەوە بەڵام هەر وەك ئامرازی تووڵی سیحری (Magic Wand)، بە یەك کلیك هەموو ئەو ڕەنگانە دەسڕێتەوە کە لەیەك دەچن.

بۆ بەکارهێنانی ئامرازی تووڵی سیحری هەنگاوەکانی خوارەوە بەکاربێنە.

1. کلیکی ڕاست لەسەر ئامرازی سڕینەوەی ئاسایی بکە و کلیك لەسەر Magic Eraser Tool بکە.
2. لێرەدا ئاستی تۆلێرانس (Tolerance، واتە ڕێگەپێدان) دیاری بکە. تۆلێرانسی کەم تەنها ئەو ڕەنگانە ئەسڕێتەوە کە زۆر لەیەکەوە نزیکن، تۆلێرانسی زۆریش کۆمەڵێك ڕەنگی زۆر دەسڕێتەوە.






**ئاستی ئۆپاسیتی دیاری بکە، ئۆپاسیتی دیاریدەکات کە چەندێك بە بەهێزی ئامرازەکە بابەتەکان دەسڕێتەوە، ئەگەر 100٪ بێت ئەوا بە تەواوەتی ڕەنگی ئەو ناوچەیە دەسڕێتەوە کە کلیکی لەسەر دەکەیت و ناوچەکە شەفاف دەبێت. بەڵام ئەگەر کەمتربوو ڕێژەکەی ئەوا بڕێك ڕەنگ بەجێ دەمێنێت لەکاتی سڕینەوەدا، ئەمەش سوودی هەیە بۆ دروستکردنی کاریگەری تایبەت.**



3. **ئێستا کلیك لەسەر ئەو ناوچەیەی وێنەکە بکە کە ئەتەوێت بیسڕیتەوە.**

**لە وێنەکەی خوارەوەدا ئێمە بە بەکارهێنانی ئامرازی سڕینەوەی سیحری ئاسمانەکەمان سڕیوەتەوە.**

**بەڵام سەرەتا بە ئامرازی لاسوو بەشی سەرەوەی وێنەکەمان سێلێکت کردووە، چونکە ڕەنگی ئاسمانەکە زۆر لە ڕەنگی گۆمەکەوە نزیکە و ئەویش دەسڕایەوە ئەگەر ئاسمانەکەمان بە تایبەتی جیا نەکردایەتەوە.**

## ئامرازی پێنسڵ Pencil




**ئامرازی پێنسڵ (Pencil، واتە پێنووس یان قەڵەم)، شێوازی ئیشکردنی وەك ئامرازی برەش (فڵچە) وایە، بەڵام پێنسڵ ئەتوانێت تەنها هێڵی یەك ڕەنگ دروست بکات.**

**بۆ هەڵبژاردنی ئامرازی پێنسڵ کلیکی ڕاست لەسەر ئامرازی برەش بکە و Pencil Tool هەڵبژێرە.**




**ئەشتوانیت کلیك لەسەر کلیلی B بکەیت بۆ هەڵبژاردنی ئامرازی پێنسڵ. ئەگەر بە پەنجە نان بە کلیلی B دا ئامرازی برەش هەڵبژێررا، Shift+B بکە.**

**ئامرازی پێنسڵ هەڵبژاردنی تایبەت بە خۆی هەیە لە ئۆپشنزباردا کە ئەتوانیت بەکاریان بێنیت بۆ کۆنترۆڵکردنی شێوازی کارکردنی قەڵەمەکەت.**

# بەشی هەشتەم

# ڕەنگکردنی دیجیتاڵی

## ڕەنگی فۆرگراوند، ڕەنگی باکگراوند

ئێستا کە تۆزێك فێربوویت دەربارەی بەکارهێنانی فڵچەکان و ئامڕازەکانی ڕەنگکردن، پێویستە بزانیت چۆن ئەو ڕەنگانە هەڵبژێریت کە بەکاریان دەهێنیت بۆ ڕەنگکردن.

هەمیشە لە فۆتۆشۆپدا دوو ڕەنگی چالاکت لەبەردەستایە بۆ بەکارهێنان. ڕەنگێکی فۆرگراوند، واتە پێشەوە، لەگەڵ ڕەنگێکی باکگراوند، واتە دواوە. ڕەنگی فۆرگراوند ئەو ڕەنگەیە کە بەکاری دەهێنیت بۆ ڕەنگکردن و نووسین، ئەو ڕەنگەیە کە فڵچەکەت بەکاری دەهێنێت. ڕەنگی باکگراوند ئەو ڕەنگەیە کە فۆتۆشۆپ بەکاری دەهێنێت کاتێك تۆ ناوچەیەکی سەر لایەری دواوەی وێنەکە دەسڕیتەوە، بەسادەیی واتە ڕەنگی ڕووتەختی وێنەکەتە.

## هەڵبژاردنی ڕەنگ




خێراترین و ئاسانترین ڕێگا بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگ بریتییە لە بەکارهێنانی بۆکسەکانی فۆرگراوند و باکگراوندی سەر توولبۆکسی فۆتۆشۆپی.

1. ڕەنگی فۆرگراوند.
2. ڕەنگی باکگراوند.
3. گەڕاندنەوەی دوو ڕەنگەکەی سەرەوە بۆ باری ئاساییان، واتە بۆ ڕەش و سپی.
4. گۆڕینەوەی ڕەنگی فۆرگراوند و باکگراوند.

بۆ ئەنجامدانی ئیشی دوگمەی (3) ئەتوانیت پەنجە بە کلیلی D دا بنێیت. بۆ گۆڕینەوەی ڕەنگیش (4) پەنجە بە کلیلی X دا بنێ.

## ویندۆی هەڵبژاردنی ڕەنگ Color Picker




ویندۆی هەڵبژاردنی ڕەنگ ڕێگەت پێ ئەدات بە چەند ڕێگایەك ڕەنگی فۆرگراوند و باکگراوند هەڵبژێریت.

بە کلیك کردن لەسەر بۆکسی فۆرگراوند یان باکگراوند، ویندۆی Color Picker ت بۆ دەکرێتەوە.



به کلیك کردن لەسەر بۆکسەکانی فۆرگراوند و باکگراوند لە تووڵبۆکسەکەدا، دایەلۆگ بۆکسەکەی سەرەوە، واتە دایەلۆگ بۆکسی هەڵبژاردنی ڕەنگت بۆ ئەکرێتەوە.

لە بەشەکانی پێشوودا باسی بەکارهێنانی ویندۆی هەڵبژاردنی ڕەنگمان کرد، بۆیە ئێستا دووبارەی ناکەینەوە. بە سادەیی، بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگێك، بە خواستی خۆت دەستکاری کۆنترۆڵەکانی ناو ویندۆکە بکە.



## پالیتی نموونەکان Swatches

پالیتی Swatches (سووچ، واتە نموونە)، لە دوکانی بازرگانی قوماشدا ئەلبومێك هەیە کە پارچەی بچووکی لەسەرە لە قوماش، کە نموونەی ئەو قوماشانەن کە هەیەتی بۆ فرۆشتن، بە هەر یەکێك لەم نموونانە دەوترێت سووچ) ڕێگەیەکی ترە بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگ.

ئەم پالیتە کۆمەڵێك ڕەنگی ئامادەکراوی تێدایە کە ئەتوانیت بە خێرایی بەکاریان بێنیت. بۆ بەکارهێنانی پالیتی نموونەکان:

1. کلیك لەسەر ئایکۆنی پالیتی نموونەکان بکە لە لای ڕاست شاشەی فۆتۆشۆپدا.

2. بەڵام ئەگەر ئایکۆنی پالیتی نموونەکان دیار نەبوو، لە لیستی Window دا کلیك لەسەر Swatches بکە.






3. دوای کرانەوەی پالیتی نموونەکان، بۆ هەڵبژاردنی ڕەنگێك، کلیك لەسەر چوارگۆشەی تایبەت بە ڕەنگەکە بکە.




ئێستا باسی چەند ئیشێکی گرنگ دەکەین تایبەت بە پالیتی نموونەکان. بۆ گۆڕینی شێوازی پیشاندانی چوارگۆشەی ڕەنگەکان:

1. لەسەر پالیتی نموونەکان کلیك لێرە بکە.




PANTONE solid to process
PANTONE solid uncoated
Photo Filter Colors
TOYO 94 COLOR FINDER
TOYO COLOR FINDER
TRUMATCH Colors
VisiBone
VisiBone2
Web Hues
Web Safe Colors
Web Spectrum
Windows

2. کلیك لەسەر یەکێك لەم چوار هەڵبژاردنە بکە و تاقییان بکەرەوە بۆ دۆزینەوەی شێوازێك کە بە خواستی تۆ بێت.




بۆ گۆڕینی کۆمەڵەی ڕەنگەکان، واتە دابەزاندنی کۆمەڵێك ڕەنگی جیاواز لە کۆمەڵەکەی ئێستا:

1. لەسەر پالیتی نموونەکان کلیك لێرە بکە.




New Swatch...
Small Thumbnail
Large Thumbnail
Small List
Large List
Preset Manager...
Reset Swatches...
Load Swatches...
Save Swatches...
Save Swatches for Exchange.
Replace Swatches...
ANPA Colors
DIC Color Guide
FOCOLTONE Colors
HKS E Process

2. کلیك لەسەر یەكێك لە هەڵبژاردنەكان بكە. وەك دەبینیت كۆمەڵەی زۆرت لەبەردەستایە و لە یەك ڕیزدا جێیان نەبووەتەوە، بۆیە لە دوو ڕیزدان.



بۆ زیادكردنی ڕەنگێكی نوێ بۆناو كۆمەڵەكە:

1. لە تووڵبۆكسدا كلیك لەسەر بۆكسی فۆرگراوند بكە.




2. دایەلۆگ بۆكسی هەڵبژاردنی ڕەنگت بۆ دەكرێتەوە. ڕەنگێك هەڵبژێرە.

3. کلیك لەسەر OK بکە.







4. پالیتی نموونەکان بکەرەوە بە کلیك کردن لەسەر ئایکۆنەکەی یاخود بە کلیك کردن لەسەر Swatches لە مێنیوی Window دا.




5. کلیك لەسەر سووچی لای ڕاستی خوارەوەی پالیتی نموونەکان بکە و سووچەکە ڕابکێشە، بۆ گەورەکردنی پالیتەکە. وەك لە وێنەکەدا دیارە.




6. ماوسەکەت بووەستێنە لەسەر بۆشاییە نوێکەی خوار چوارگۆشەی ڕەنگەکان، دەبینیت کە ئیشارەتی ماوسەکە دەبێت بە سەتڵێك. لێرەدا کلیك بکە.




7. دایەلۆگ بۆکسی Color Swatch Name دەکرێتەوە. لێرەدا ناوێك بۆ ڕەنگەکەت بنووسە بۆ ناسینەوەی. فۆتۆشۆپی بە ئۆتۆماتیکی ناوێکی بۆ دەنووسێت، لەبەر ئەوە ئەگەر ئیشەکەت بە پەلەیە ئەتوانیت گۆڕانکاری لە ناوەکەدا نەکەیت.




8. کلیك لەسەر OK بکە.




9. ئێستا ڕەنگە نوێکەت دەچێتە ناو پالێتەکەوە، واتە چوارگۆشەیەکی نوێی بۆ دروست دەبێت، لە کۆتایی پالێتەکەدا. لە وێنەکەی خوارەوەدا بۆ زیاتر دەرکەوتنی چوارگۆشەکە شێوازی دەرکەوتنی چوارگۆشەکانمان گۆڕیوە، پێشتر باسی چۆنێتی گۆڕینی پیشاندانی چوارگۆشەکانمان کرد.

## مۆدەکانی تێکەڵبوون

## Blending Modes

لە دنیای ڕاستەقینەدا کاتێك فڵچەیەك کە ڕەنگی پێوەبێت دەهێنیت بەسەر ڕەنگێکدا کە پێشتر بە فڵچەیەکی تر ڕەنگکرابێت، ئەوا ئەنجامی جیاوازت دەستدەکەوێت، بە پشت بەستن بە چەند هۆکارێك، وەك ئەوەی ئایا ڕەنگە کۆنەکە تەڕ بێت یان ووشك بووبێتەوە، یان ئایا ڕەنگە نوێکە تۆختربێت لە ڕەنگەکەی پێشوو. لە فۆتۆشۆپدا ئەتوانیت کۆنترۆڵی شێوازی تێکەڵبوونی ڕەنگەکان بکەیت بە بەکارهێنانی مۆدەکانی تێکەڵبوون.

مۆدەکانی تێکەڵبوون لە ئۆپشنزبارپدان، وەك لە وێنەکەی خوارەوەدا دیارە.



**مۆدەکانی تێکەڵبوون لەگەڵ هەموو ئەو ئامرازانەدا بەکاردێن کە هێڵ دروست دەکەن یان بۆیە دەکەن (قەڵەم و فڵچە).**

**بۆ تێگەیشتن لە مۆدەکانی تێکەڵبوون، وای دابنێ تۆ ئیش لەسەر وێنەیەك دەکەیت کە دوو ڕەنگی تێدا بەکاردەهێنیت. ڕەنگی یەکەمیان ڕەنگی تەختی وێنەکەیە، کە یەکەمجار بەکاری دەهێنیت. دواتر، ڕەنگەکەی تر بەکاردەهێنیت بەسەر ئەم ڕەنگەدا. بە تێکەڵبوونی دوو ڕەنگەکە ڕەنگێکی نوێ دروست دەبێت.**

**لە خوارەوەدا شێوازی ئیشکردنی مۆدە جیاوازەکانمان بە وێنەوە باسکردووە. وێنەکان باکگراوندی سەوزیان هەیە و بە ڕەنگی پەمەیی وێنەکانمان لەسەر دروستکردوون، بێجە لە ئەو وێنانەی کە ووشەی R ن، کە تیایاندا باکگراوندی پەمەیی و فڵچەی سەوزمان بەکارهێناوە.**

| | |
|---|---|
| Normal: ئەمە مۆدیی ئەسڵیی فۆتۆشۆپە. ڕەنگە نوێکە ڕەنگەی دواوە دەشارێتەوە. | |
| Dissolve: هەندێك لە پیکسێلەکان تێکەڵ بە ڕەنگەکەی دواوە دەبن. ئەنجامەکەشی وێنەیەکی زبرە. | |
| Darken: تەماشای هەر دوو ڕەنگەکەی دواوە و پێشەوە دەکات و هەر کامیان تۆختربێت ئەو ڕەنگە بەکاردەهێنێت. | |

| | |
|---|---|
| Multiply: ڕەنگەکەی داوەوە دەدات کەرەتی ڕەنگەکەی پێشەوە دەکات، ئەنجامەکەشی ڕەنگێکی تاریکترە. | |
| Color Burn: ڕەنگەکەی دواوە تۆخ تاریك دەکات بۆ ئەوەی تاریکییەکەی بگاتەوە بە ڕەنگەکەی پێشەوەدا. | |
| Linear Burn: ڕەنگەکەی داوەوە تاریکتر دەکات بۆ ئەوەی وەك ڕەنگەکەی پێشەوەی لێبێت. بەکارهێنانی ڕەنگی سپی هیچ تێکەڵبوونێکی لێ ناکەوێتەوە. | |
| Lighten: تەماشای ڕەنگەکانی پێشەوە و دواوە دەکات و هەرکامیان ڕووناکتربێت ئەو ڕەنگە بەکاردەهێنێت. | |

Screen: ڕەنگەکەی داوەوە کەرەتی هەڵگەڕاوەی ڕەنگەکەی پێشەوە دەکات، ئەنجامەکەشی ڕەنگێکی ڕووناکترە.

Color Dodge: ڕەنگەکەی دواوە ڕووناک دەکاتەوە بۆ ئەوەی بگاتەوە بە ڕەنگەکەی پێشەوە.

Linear Dodge (Add): ڕەنگەکەی دواوە ڕووناک دەکاتەوە بۆ ئەوەی بگات بە ڕەنگەکەی پێشەوە. لەگەڵ ڕەنگی ڕەشدا هیچ گۆڕانکارییەک دروست ناکات.

Overlay: تەماشای ڕەنگەکانی ناو کەناڵە جیاوازەکان دەکات و یان ڕەنگەکەی دواوە بەکاردەهێنێت یان ڕەنگەکەی پێشەوە، هەر کامیان تاریکتربێت. پیکسێلە ڕووناکەکان دەگۆڕرێن، بەڵام پیکسێلە تاریکەکان گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت.

Soft Light: تاریکتر یان ڕووناکتر دەکاتەوە بە پشت بەستن بە ڕەنگەکەی پێشەوە. ئەنجامەکەی وەک تێکەڵبوونی دوو تیشکە کە لە دوو گڵۆپەوە دەربچن.

Hard Light: وەک سەرەوە وایە بەڵام گڵۆپەکان لێرەدا بەهێزترن.

Vivid Light: ڕەنگەکان ڕووناک یان تاریک دەکاتەوە بە زیادکردن یان کەمکردنەوەی کۆنتراست، بە پشت بەستن بە ڕەنگەکەی سەرەوە.

Linear Light: ڕەنگەکان تاریک یان ڕووناک دەکاتەوە بە زیادکردن یان کەمکردنەوەی ڕووناکی (brightness)، بە پشت بەستن بە ڕەنگەکەی پێشەوە.

Pin Light: ڕەنگەکان دەگۆڕێتەوە بە پشت بەستن بە ڕەنگەکەی پێشەوە.

Hard Mix: تێکەڵکراوی Hard Light و Vivid Light ە.

Difference: بەراوردی نێوان ئاستی ڕووناکی ڕەنگەکانی پێشەوە و دواوە دەکات و ئەو ڕەنگە لادەبات کە ڕووناکترە.

Exclusion: وەک Difference ە، بەڵام ئیشکردنەکەی نەرمترە.

| | |
|---|---|
| Hue: رادەکانی luminance و saturation ی ڕەنگەکەی دواوە تێکەڵ بە رادەی hue سی ڕەنگەکەی پێشەوە دەکات. | |
| Saturation: رادەکانی luminance و hue ی ڕەنگەکەی دواوە تێکەڵ بە رادەی saturation ڕەنگەکەی پێشەوە دەکات. لە ڕەش و سپیدا جیاوازییەکە یان دەرناکەوێت یان زۆر بەکەمی دەردەکەوێت. | |
| Color: رادەی luminance ی ڕەنگەکەی دواوە تێکەڵ دەکات لەگەڵ رادەکانی hue و saturation ی ڕەنگەکەی پێشەوە. | |
| Luminosity: رادەکانی hue و saturation ی ڕەنگەکەی دواوە تێکەڵ بە lamination ی ڕەنگەکەی پێشەوە دەکات. پێچەوانەی Color ە. | |
| Lighter Color: وەك Lighten وایە، بەلأم ئیش لەسەر هەموو کەناڵەکان دەکات پێکەوە. | |
| Darker Color: ئیشی وەك Darken وایە، بەلأم ئیش لەسەر هەموو کەناڵەکان دەکات پێکەوە. | |

دوو مۆدی دیکەی تێکەڵبوونمان هەیە، Behind و Clear. مۆدی Behind ڕێگەت پێ ئەدات تەنها ڕەنگی ناوچە شەفافەکانی لایەرێك بکەیت. مۆدی Clear وەك ئامرازی سڕینەوە هەموو ئەو پیکسێلانە ئەسڕێتەوە کە ڕەنگیان ئەکەیت.

# بەشی نۆیەم

# جــــــوولاندنی ڕەنگ



## ئامڕازی Smudge

ئیشکردنی ئەم ئامڕازە وەك پەنجەیەك وایە کە بیهێنیت بەسەر وێنەیەك کە هێشتا بۆیەکەی تەڕ بێت. بۆ بەکارهێنانی ئەم ئامڕازە:

1. کلیکی ڕاست لەسەر ئامڕازی Blur بکە.




2. کلیك لەسەر ئامڕازی Smudge بکە.



3. کلیك لەسەر شوێنێکی وێنەکە بکە و ماوسەکەت ڕابکێشە، دەبینیت کە ناوچەکە لەگەڵ ماوسەکەدا دێت.




4. بۆ دیاریکردنی ئاستی بەهێزی کارکردنی ئەم ئامرازە، سلایدەری Strength بەکاربێنە.

## ئامرازی لێڵکردن
## Blur

ئەم ئامرازە وەك لە ناوەکەیەوە دیارە وێنەکان لێڵ دەکات، بە لێڵکردنیشیان دیمەنێکی نەرمتریان پێ دەبەخشێت، بۆیە ئەگەر لەسەر وێنەی شتێکی زبر بەکاری بێنیت ئەوا ساف یان نەرمیان دەکات. واتە ڕەنگی پیکسێلەکانی ناوچەیەك دەگۆڕێت بۆ ئەوەی زیاتر لەیەك بچن. بۆ بەکارهێنانی ئامرازی لێڵکردن:







1. کلیك لەسەر ئایکۆنی ئامرازەکە بکە لە تووڵبۆکسی فۆتۆشۆپدا.
2. سلایدەری Strength بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی هێزی ئامرازەکە.
3. کلیك لەسەر ئەو شوێنە بکە کە ئەتەوێت لێڵی بکەیت. وێنەکەی خوارەوە بەرگی ڕۆمانی Wintersmith ی نووسەری بەناوبانگی بەریتانی Terry Pratchett ە، ئێمە ناوی نووسەرەکان لێڵ کردووە، دەبینیت کە کاریگەرییەکی تایبەتی بەخشیوە بە ووشەکەی خوار ناوی نووسەرەکە (مەبەستمان ووشەی Wintersmith ە)، وەك ئەوەی کە لە پێشترەوە بێت.



## ئامرازی ڕوونکردن Sharpen



نیشی ئامرازی ڕوونکردن پێچەوانەی ئامرازی لێلکردنە. ئەتوانیت بەکاری بێنیت بۆ زیاتر ڕوونکردنی شتێك کە لە وێنەکەدا لێڵ بێت. بەڵام ئەبێت بە وریاییەوە بەکاری بێنیت چونکە ئەگەر بەهێز بێت ڕەنگی وێنەکەت تێك ئەدات.

لە خوارەوەدا وێنەیەکمان هەیە کە دوو گوڵی تێدایە، گوڵەکەی دواوە لێڵە.

بە بەکارهێنانی ئامرازی ڕوونکردن گوڵەکەی دواوەمان ڕوونتر کردووەتەوە، بەڵام دەبینیت کە لە هەندێك شوێندا پەڵە لەسەر گوڵەکە دروست بووە.




بۆ بەکارهێنانی ئامرازی ڕوونکردن:

1. کلیکی ڕاست لەسەر ئامرازی لێڵکردن Blur بکە.




2. کلیك لەسەر Sharpen Tool بکە.

3. بۆ دیاریکردنی هێزی ئامرازەکە، سلایدەری Strength بەکاربێنە.




4. کلیك لەسەر شوێنێك بکە بۆ ڕوونکردنی. هەتا زیاتر پەنجە لەسەر کلیك دابنێیت، وێنەکە ڕوونتر دەبێت.




## ئامرازی ڕووناککردنەوە Dodge Tool



ئامرازی ڕووناککردنەوە بەکاردێت بۆ ڕووناککردنەوە، یان سپیکردنەوە، ی ئەو شوێنەی کە ئامرازەکەی لەسەر بەکاردەهێنیت. وێنەی ئامرازەکە بریتییە لە وێنەیەك کە لە زەڕەبین دەچێت، بەڵام ڕاستیدا ئەمە وێنەی ئامرازێکە کە وێنەگرەکان لەکاتی شتنەوەی فیلمدا بەکاری دەهێنن، ئەم ئامرازە ڕێگە لە تیشك دەکرێت کە بەر ناوچەیەکی کاغەزی شتنەوەی فیلمەکە بکەوێت، لە ئەنجامیشدا ئەم ناوچەیە ڕووناکتر دەردەچێت.

لە خوارەوەدا وێنەیەکمان هەیە کە زەوییەکەی تا ڕادەیەك تاریکە.



دوای بەکارهێنانی ئامرازی ڕووناککر دنەوە، وێنەکەی خوارەوەمان دەست کەوت:



بۆ بەکارهێنانی ئامرازی ڕووناککردنەوە:

1. لە تووڵبۆکسی فۆتۆشۆپدا کلیك لەسەر Dodge Tool بکە.
2. لە لیستی Range دا دیاری بکە ئامرازەکە کاریگەری لەسەر چ جۆرە ڕەنگێك هەبێت، تاریك (Shadows)، مامناوەند (Midtones)، یان ڕووناك (Highlights). ئەم هەنگاوە گرنگی زۆری هەیە و هەر یەکێك لە هەڵبژاردنەکان کاریگەرییەکی تایبەت لەسەر وێنەکە دروست دەکات.



3. سلایدەری Exposure (ئێکسپۆژەر، واتە بەرکەوتن) بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی هێزی ئامرازەکە.




شتێکی چاکە کە قەبارەی فڵچەکەت بچووک بکەیتەوە بۆ ئەوەی ئیشەکەت ڕێکوپێکتر بێت.

5



4. دوای ئامادەکردنی فڵچەکەت، کاتی دەستکاریکردنی وێنەکەتە. کلیك لەسەر ئەو شوێنانە بکە کە ئەتەوێت ڕووناکی بکەیتەوە. بۆ نموونە دەموچاوی کەسێك. لە خوارەوەدا وێنەی ئەم خانمە وردیلەمان هێناوە و بەهۆی ئامرازی تووڵی سیحرییەوە (Magic Wand) پێستی دەم وچاویمان دیاریکردووە، بۆ ئەوەی دواتر کە ئامرازی Dodge بەکاردێنین تەنها پێستی دەم وچاوی ڕووناك ببێتەوە، نەك چاوەکانی یان برۆکانی یاخود قژی.



وێنەکە پێش دەستکاریکردنی:



**وێنەکە دوای دەستکاریکردن:**

ئێمە ڕێگەمان نەداوە کە ئامرازەکە بەر لێوەکانی بکەوێت، چونکە پێویستیان بە کاڵکردنەوە نییە. دەبینیت کە هەندێك لە سێبەرەکان دیار نەماون و وێنەکە بڕێك لە جوانییەکەی لەدەست داوە، هۆکاری ئەمەش بریتییە لەوەی کە ئێمە کاتێکی زۆرمان لەگەڵ دەستکاریکردنی وێنەکەدا بەسەر نەبردووە.

## ئامرازی Burn




Burn (بێرن) واتە سووتاندن.

ئیشی ئەم ئامرازی بە پێچەوانەی ئامرازی Dodge ەوەیە و ئیشی سووتاندن یان تاریککردنی ناوچەی دیاریکراوە.

بۆ بەکارهێنانی ئامرازی Burn:

1. کلیکی ڕاست لەسەر ئامرازی Dodge بکە.
2. لیستێك دەکرێتەوە، کلیك لەسەر Burn Tool بکە
3. بە هەمان شێوەی ئامرازی Dodge، ئۆپشنزبار بەکاربێنە بۆ کۆنترۆڵکردنی شێوازی کارکردنی ئامرازەکە.

4. ئەگەری پێویستی کرد ئامرازی تووڵی سیحری یان ئامرازێکی دیکەی سێلێکتکردن بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ئەو ناوچانەی کە ئەتەوێت بیسوتێنیت.
5. کلیك لەسەر ئەو شوێنەی وێنەکە بکە کە ئەتەوێت بیستوونێت.



## ئامرازی Sponge

Sponge (سپۆنج) واتە ئیسفەنج. ناوی ئەم ئامرازە لە ئەو ئیسفەنجەوە هاتووە کە وێنەگر لە کاتی شتنەوەی فیلمەکانیدا لە ژووره تاریکەکەیدا بەکاری دێنێت بۆ تۆخکردنەوەی ڕەنگی وێنەکەی.
ئەم ئامرازە لە یەك لیستدایە لەگەڵ ئامرازەکانی Dodge و Burn.







لە نۆپشنزبارڕدا دیاری بکە ئایا ئەتەوێت ئامرازەکە ڕەنگەکانی وێنەکەت تۆخ (Saturate) یان کاڵ (desaturate) بکاتەوە.

# بەشی دەیەم

# تەکنیکە پێشکەوتووەکانی وێنەکێشان

## بۆیەی ئاوی

## Watercolors




فۆتۆشۆپی فیلتەرێکی هەیە کە وێنەیەك دەگۆڕێت بۆ ئەوەی وا دەربکەوێت کە بە بۆیەی ئاوی وێنەکراوە.

فیلتەرەکان لە فۆتۆشۆپدا بریتین لە کۆمەڵێك فرمان کە کاریگەری دیاریکراو لەسەر وێنەکەت دروست دەکەن.

فیلتەری بۆیەی ئاوی لەسەر ئەو وێنانە بەباشی کاردەکات کە ناوچەی گەورەی یەك ڕەنگی تێدایە و ڕەنگەکانی ئاڵۆز نین.

بۆ بەکارهێنانی فلتەری بۆیەی ئاوی:

1. وێنەیەك بکەرەوە.




2. لە لیستی Filter دا ماوسەکەت لەسەر Artistic بوەستێنە و کلیك لەسەر Watercolor بکە.

3. لێرەدا ئەتوانیت دیمەنی وێنەکەت ببینیت دوای دانانی فیلتەرەکە لەسەری. واتە ئەمە پێشبینی چۆنێتی دەرکەوتنی وێنەکەیە دوای دانانی فیلتەرەکە.




4. لێرەدا ئەو فیلتەرە دیاریکراوە کە تۆ هەڵتبژاردووە، کە فیلتەری Watercolor ە.



5. سلایدەری Brush Detail بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ئاستی نزیکی شێوەی وێنەکە لە وێنە ڕاستییەکەوە تەماشای جیاوازی وێنەی منداڵەکە بکە لەم هەنگاوەدا لەگەڵ هەنگاوی پێشوودا. لێرەدا سلایدەرەکەمان ڕاکێشاوە بۆ بەرزترین پلە



6. سلایدەری Shadow Intensity بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی بەهێزیی سێبەرەکان.



7. سلایدەری Texture بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ئاستی زبری.




8. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە بۆ تەواوکردنی کارەکەت. ئەشتوانیت کلیك لەسەر Cancel بکەیت بۆ گەڕانەوە بۆ وێنەکە بەبێ ئەنجامدانی گۆڕانکاری.





10. لە كۆتاییدا وێنەكەمان بووەتە وێنەیەكی بۆیەی ئاوی.



## بۆیەی ڕۆنی
## Underpainting

وێنەیەك كە بە بۆیەی ڕۆنی كێشرابێت زۆر جیاوازە لە وێنەیەك كە بە بۆیەی ئاوی كێشرابێت. لێرەدا چۆنێتی گۆڕینی وێنەیەكی ئاسایی بۆ وێنەیەكی ڕۆنی ڕۆن دەكەینەوە، مەبەستمان ئەوەیە ڕوون دەكەینەوە.

1. سەرەتا وێنەیەك بكەرەوە، وەك ئەم گوڵە جوانەی خوارەوە.
2. لە مێنیوی Filter دا ماوسەكەت لەسەر Artistic بووەستێنە و كلیكل لەسەر Underpainting بكە.



3. سلایدەری Brush Size بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ڕووبەری دەمی فڵچەکەت. هەتا ڕووبەرەکە کەمتربێت وێنەکە زیاتر لە وێنە ڕاستییەکەوە نزیك دەبێت.




4. سلایدەری Texture Coverage بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ئاستی زبری فڵچەکە.




5. سلایدەری Scaling بکە بە لەسەدا 70 بۆ ئەوەی وێنەکە زۆر دوور نەکەوێتەوە لە شێوە ڕاستەقینەکەی.



6. سلایدەری Relief یش ئاستی زبری دیاریدەکات. پلەی 7 پلەیەکی باشە بۆ ئەم سلایدەرە.




7. لە لیستی Line دا ئاراستەی بەرکەوتنی ڕووناکی دیاری بکە.




8. ئەتوانیت ئەم دوو ئیشارەتی سالب و موجەبە بەکاربێنیت بۆ گەورە وبچووک کردنی نموونەکە.



9. لە لیستی Texture دا جۆری ڕووکەشی وێنەکە دیاری بکە.



10. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.



11. لە ئەنجامدا وێنەکەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت:



## فلتەری قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگ Colored Pencil

فۆتۆشۆپ ئەتوانێت وێنەیەکی ئاسایی بگۆڕێت بۆ وێنەیەك کە بە قەڵەم کێشرابێت. ئەتوانیت ئەنجامی زۆر باش بەدەست بێنیت لەگەڵ بەکارهێنانی ئەم فلتەرەدا، بەتایبەتی لەگەڵ وێنەی ڕەش و سپیدا. ئەتوانیت وێنەکەت بگۆڕیت بە ڕەش و سپی پێش بەکارهێنانی فیلتەرەکە.

1. وێنەیەك بکەرەوە. ئێمە وێنەیەکی تاج محەلمان لێرەدا بەکارهێناوە.




2. لە لیستی Filter دا ماوسەکەت لەسەر Artistic بووەستێنە و کلیك لەسەر Colored Pencil بکە.

3. دایەلۆگ بۆکسی فیلتەرەکە بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی شێوازی نیشکردنی فیلتەرەکە.




4. لە ئەنجامدا وێنەکەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت.



فۆتۆشۆپی 10 نزیکەی 100 فیلتەری تێدایە. ئەتوانیت خۆت یەکە یەکە تاقییان بکەیتەوە. بەڵام ئێمە وا بەچاك ئەزانین کە هەر ڕۆژەی، یان هەر هەفتەی، خۆت خەریکی یەك فیلتەر بکەیت. بەم شێوەیە ئەتوانیت فیلتەرکان بەشێوەی سەرسوڕهێنەر بەکاربێنیت.

# بەشی یانزەیەم

# بەکارهێنانی ترانسفۆرمەیشنەکان



## گۆڕینی ڕووبەری وێنەکە

لە ڕابردوودا باسی گۆڕینی ڕووبەری کانڤاسمان کرد، کە بریتییە لە ئەو ڕووتەختەی کە وێنەکەی لەسەرە. ئێستا باسی گۆڕینی ڕووبەری وێنەکانی سەر کانڤاس دەکەین. بێ شك بە گۆڕینی ڕووبەری وێنەکە، ڕووبەری کانڤاسەکەش لەگەڵیدا دەگۆڕێت. بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە کە کاتێك تۆ ڕووبەری وێنەکە دەگۆڕیت و گەورەی دەکەیت، پرۆسەکە وەك ڕاکێشانی سووچەکانی وێنەکە وایە بۆ گەورەکردنی. بەڵام لەکاتی گۆڕینی ڕووبەری کانڤاسدا وێنەکە خۆی هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، تەنها بە چوارچێوەی وێنەکەدا بۆشاییەکی سپی دروست دەبوو.
بۆ زیاتر تێگەیشتن ئەتوانیت ڕووبەری کانڤاس وێنەیەك (Canvas Size) بگۆڕیت، پاشان ڕووبەری وێنەکە خۆی (Image Size) بگۆڕیت، وەك لێرەدا باسی لێ دەکەین.

1. سەرەتا وێنەیەك بکەرەوە.

2. لە مێنیوی Image دا کلیك لەسەر Image Size بکە.




3. دایەلۆگ بۆکسی Image Size دەکرێتەوە. لێرەدا ئەتوانیت ڕووبەرێکی نوێ بۆ وێنەکەت دیاری بکەیت بە بەکارهێنانی ژمارەی پیکسێلەکان.




4. لەجیاتی هەنگاوی (3)، ئەتوانیت ئەم دوو بۆکسە بەکاربێنیت بۆ دیاریکردنی ڕوو بەری نوێی وێنەکە. بەلاّم سەرەتا تەماشا ی هەنگاوی (5) بکە.




5. لێرەدا یەکەی پێوانەی درێژی و پانی دیاری بکە، ئایا ئینچ بێت یان سانتیمەتر هتد.




6. لێرەدا قەبارەی نوێی فایلەکەت پیشان ئەدرێت، واتە بڕی ئەو شوێنەی لەسەر هاردیسکی کۆمپیوتەرکەت داگیری ئەکات. لە کەوانەکەشدا قەبارە کۆنەکە ئەنووسرێت بۆ بەراورد.




7. لە کۆتاییدا کلیک لەسەر OK بکە.



## گۆڕینی قەبارەی ناوچەیەکی سێلێکت کراو

ئەتوانیت بابەتێکی دیاریکراو لە وێنەکەدا هەڵبژێریت و بچووك یان گەورەی بکەیت. بۆ نموونە لە هەنگاوەکانی خوارەوەدا وێنەی منداڵێکمان هەیە کە گەورەی دەکەین لە وێنەکەدا بەبێ گۆڕینی بابەتەکانی تری وێنەکە.



1. سەرەتا وێنەیەك بکەرەوە.



2. بە بەکارهێنانی یەکێك لە ئامرازەکانی سێلێکت کردن، بابەتی خوازراو سێلێکت بکە. ئەو بابەتەی ئێمە دەمانەوێت بریتییە لە منداڵەکە.





3. لە لیستی Edit دا ماوسەکەت لەسەر Transform بووەستێنە و کلیك لەسەر Scale بکە. دەبینیت کە چوارچێوەیەکی نوێ بە دەوری منداڵەکەدا دروست دەبێت.



4. ئێستا بە ڕاکێشانی



5. چوارگۆشە ووردەکان
6. ڕووبەری ناوچەکە بگۆڕە.



دوای ئەوەی ڕووبەری ناوچەکەت کرد بەوەی کە خۆت ئەتەوێت، کلیك لێرە بکە، یاخود پەنجە بە Enter دا بنێ.

7. ئەنجامی کارەکەت وەك خوارەوە دەبێت:

**پێش گۆڕانکاری:** **دوای گۆڕانکاری:**





## سووڕاندنەوەی وێنە

زۆرجار وێنەیەکت دێتە دەست کە ڕێك ڕانەوەستاوە، بەڵکو کەوتووە بەلادا، وەك وێنەکەی خوارەوە:

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەندێك جار پێویست دەکات کامێراکەت بەلادا بگریت، هۆکارێکی تریش بریتییە لە سکانکردنی وێنەکان بەلادا، کە خێرایی سکانکردن زیاد دەکات.

لە فۆتۆشۆپدا ئەتوانیت بە چەند شێوەیەك وێنەکەت بسووڕێنیتەوە، وەك لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باسیان لێ دەکەین.



سووڕاندنەوەی 180 پلە یان 90 پلە بە ئاڕاستەی سووڕانەوەی کاتژمێر یان پێچەوانەی سووڕانەوەی کاتژمێر

بۆ سووڕاندنەوەی هەموو وێنەکە:

1. وێنەیەك بکەرەوە.

2. لە مێنیوی Image دا ماوسەکەت لەسەر Rotate Canvas بووەستێنە.



3. بۆ سوورِاندنەوەی وێنەکە 180 پلە، کلیك لەسەر 180 بکە. بۆ سوورِاندنەوەی وێنەکە 90 پلە بە ئاراستەی سوورِانەوەی میلی کاتژمێر، کلیك لەسەر 90 CW بکە، بۆ سوورِاندنەوەی وێنەکە 90 پلە بە پێچەوانەی ئاراستەی سوورِانەوەی میلی کاتژمێر، کلیك لەسەر 90 CCW بکە.






## سوورِاندنەوە بە پلە

لە ڕێگەی ئەم فەرمانەوە ئەتوانیت خۆت گۆشەیەك بنووسیت بۆ سوورِانەوەی وێنەکە.

1. وێنەیەك بکەرەوە.



2. لە لیستی Image دا ماوسەکەت لەسەر Rotate Canvas بووەستێنە و کلیك لەسەر Arbitrary بکە.




3. دایەلۆگ بۆکسی Rotate Canvas دەکرێتەوە. لێرەدا گۆشەی سووڕانەوە داخڵ بکە.




4. لێرەدا دیاری بکە ئایا سووڕاندنەوەکە بە ئاڕاستەی سووڕانەوەی میلی کاتژمێر (CW) یان بە پێچەوانەی ئاڕاستەی سووڕانەوەی میلی کاتژمێر (CCW) بێت.




5. کلیك لەسەر OK بکە.



6. ئەنجامی کارەکەمان:



## سووڕاندنەوەی ناوچەیەکی سێلێکت کراو



1. سەرەتا وێنەیەك بکەرەوە و ناوچەیەك لە وێنەکەدا سێلێکت بکە.



2. لە لیستی Edit ماوسەکەت لەسەر Transform بووەستێنە و کلیك لەسەر Rotate بکە.



3. چوارچێوەیەکی نوێ بە دەوری ناوچە سێلێکتکراوەکەدا دروست دەبێت. یەکێك لە چوارگۆشە بچووکەکان ڕابکێشە بۆ سووڕاندنەوەی ناوچەکە.

4. کاتێك سووڕاندنەوەکەت تەواوکرد، کلیك لێرە بکە، یاخود پەنجە بە Enter دا بنێ.




5. ئەنجامی کارەکەمان:

دواتر ئەتوانیت لە ڕەنگەی کۆپی و پەیستەوە لە ناوچەکانی ترەوە بابەت بێنیت بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییە دروستبووەکە. بەهۆی ئامرازی Blur یشەوە ئەتوانیت زبری ناوچە نوێکە کەم بکەیتەوە.



# فەرمانی Skew

ئەم فەرمانە ناوچەیەکی دیاریکراو دەگرێت و خواری دەکاتەوە یان ڕێکی دەکاتەوە، بە خواستی تۆ، هەر وەك ئەوەی وێنەکە لەسەر لاستیك کرابێت کە بتوانیت بە ئارەزووی خۆت ڕای بکێشیت.




ـە وێنەکەی خوارەوەدا بۆفێیەك لەپشتی
ـۆکێوەیە کە خەریکە ئەکەوێت بەسەریدا. بۆ
ـاستکردنەوەی، سەرەتا بۆفێکەمان سیلێکت
ـکردووە.



دواتر فەرمانی Skew مان خستووەتە کار





دوای ڕاستکردنەوەی، بە فڵچە بۆشاییە دروست بووەکەمان پڕکردەوە. ئەنجامەکەش وەك خوارەوە بوو:

## فەرمانی Warp

ئەم فەرمانە کۆنترۆڵێکی زۆرت دەداتە دەست بۆ دەستکاریکردنی وێنەکانت. لە خوارەوەدا باسی چۆنێکی کارکردنی ئەکەین.



1. وێنەیەك بکەرەوە و ناوچەیەکی سێلێکت بکە. ئێمە لەخوارەوەدا هەموو وێنەکەمان سێلێکت کردووە.
2. 
3. لە لیستی Edit دا ماوسەکەت لەسەر Transform بووەستێنە و کلیك لەسەر Warp بکە.



4. خشتەیەك لە وێنەکەدا دروست دەبێت شوێنێکی وێنەکە ڕابکێشە و ئەنجامەکەی ببینە. خشتەکە پێت ئەڵێت چەندە وێنەکەت دەستکاری کردووە.







5. ئێستا ئەو ناوچەیەمان ڕاکێشاوە بۆ سەرەوە کە لە هەنگاوی (3) دا پیشانمان داویت. ئەنجامەکەش بریتییە لەوەی کە ئێستا زەوییەکە لە گردێك دەچێت نەك لە دەشتێکی تەخت.

6. دوای برێك جووڵاندنی تر، ئەنجامەکەی خوارەوەمان دەست کەوت.



# بەشی دوانزەیەم




# بەکارهێنانی لایەرەکان

## تێگەیشتن لە لایەرەکان

لایەر واتە چین. ئەکرێت وێنەیەك لە یەك لایەر یان زیاتر پێك هاتبێت. بۆ نموونە وێنەکەی خوارەوە لە سێ لایەر پێك هاتووە.



لایەری یەکەم، واتە لایەرەکەی دواوە، بریتییە لە وێنەی کچە خنجیلانەکە.



چینی دووەم بریتییە لە دڵەکە:

fairy & bird

چینی سێیەم بریتییە لە نووسینەکە:




هەر سێ چینەکە پێکەوە یەك وێنەیان دروست کردووە.

لایەرەکان یەکێکن لە گرنگترین پێکهاتەکانی فۆتۆشۆپ، کە ڕێگەت پێ ئەدەن بابەتەکانی وێنەکەت سەربەخۆبن، واتە کاتێك دەستکاری شتێك دەکەیت شتەکانی تر تێکناچن. جگە لەوەش، لایەرەکان بەکارهێنانی دیکەیان زۆرە و وەك چۆن ئۆکسیجن بۆ ژیانمان گرنگە، ئاواش لایەرەکان بۆ فۆتۆشۆپ گرنگن.

لە فۆتۆشۆپدا ئەتوانیت ژمارەیەکی زۆر لایەر دروست بکەیت (999 لایەر). ئەتوانیت لایەرەکانی تر بشاریتەوە کاتێك ئیش لەسەر لایەرێکی دیاریکراو دەکەیت. ئەتوانیت لایەرەکان پێکەوە ببەستیت. لەم بەشەدا بە درێژی باس لە لایەرەکان دەکەین.

## پالیتی لایەرەکان

لێرەدا هەنگاو بە هەنگاو باسی لایەر و تایبەتمەندێتییەکانی دەکەین.

1. هەنگاوی یەکەم بریتییە لە کردنەوەی وێنەیەك یان دروستکردنی وێنەیەکی نوێ.




2. لە مێنیوی Window دا کلیك لەسەر Layers بکە.




3. ئەشتوانیت کلیك لەسەر ئایکۆنی لایەرەکان بکەیت لە لای ڕاستی شاشەکە ئەگەر پیشان درابێت.




4. لە وێنەکەی ئێمەدا سێ لایەر هەیە، هەر سێ لایەرەکە لێرەدا بە بچووکی پیشان دراون، بە هەر یەکێك لەم وێنە بچووککراوانە دەوترێت ئەمنەیل.




ئەتوانیت قەبارەی ئەمنەیلەکان گەورەبکەیت بۆ ئەوەی لایەرەکان بە ئاسانتر بناسیتەوە. بۆ ئەم کارە:

1. سەرەتا کلیك لێرە بکە.




2. لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Palette Options بکە.




3. کلیك لەسەر قەبارەیەکی نوێ بکە.




4. ئێستا وێنەی لایەرەکان ڕوونتر دیارن.




## دروستکردنی لایەرێکی نوێ

1. کلیك لەسەر ئایکۆنی Create New Layer بکە.




2. لایەرە نوێکە لێرەدا دروست دەبێت. دەبینیت کە لایەرەکە ڕەنگی سپی نییە، بەڵکو چوارگۆشەی ڕەساسی و سپی تێدایە، وەك خانەکانی شەترەنج. ئەمەش پێت دەڵێت کە لایەرەکە شەفافە و هیچ ڕەنگی لەسەر نییە، واتە هەر چەندە ئەم لایەرە ئێستا بەسەر لایەرەکانی ترەوەیە، ئەوانی تر ناشارێتەوە.




3. دەبینیت کە وێنەی لایەرە نوێکە چوارچێوەیەکی بەدەوردایە کە جیایە لە لایەرەکانی تر، هەروەها لای ڕاستی لایەرەکە تاریکە. ئەمە پێت ئەڵێت کە ئەم لایەرە "ئاکتیڤ"ە، واتە بۆ نموونە ئەگەر بە ئامرازی قەڵەم شتێك دروست بکەیت، ئەوا لەسەر ئەم لایەرە دروست دەبێت، واتە تۆ ئێستا ئیش لەم لایەرەدا دەکەیت.

## گۆڕینی ڕیزبەندی لایەرەکان

شێوازی ڕیزبوونی لایەرەکان دیاری دەکات چ لایەرەك زاڵە بەسەر لایەرەکانی تردا. بۆ نموونە لە وێنەکەی خوارەوەدا تەیرە باڵابەرزەکە لەپێش تەیرە باڵاکورتەکەویە:






هۆکاری ئەمەش بریتییە لەوەی کە لایەری تەیرە باڵابەرزەکە (Layer 3) لەسەرەوەی لایەری تەیرە باڵاکورتەکە (Layer 2) ەوەیە:




ئەتوانیت شوێنی لایەرەکان بگۆڕیت لە پالیتەکەدا بۆ ئەوەی تەیرە باڵابەرزەکە بچێتە دواوە. بۆ ئەم مەبەستە کلیك لەسەر لایەری تەیرە باڵابەرزەکە بکە و ڕای بکێشە بۆ ژێر لایەری تەیرەباڵاکورتەکە:




**پاشان دەست لەسەر کلیك هەڵبگرە. ئێستا ڕیزبوونی لایەرەکان وەك خوارەوەیە:**





**وێنەکەشمان وەك خوارەوەی لێدێت:**

## شاردنەوەی لایەرەکان

**تایبەتمەندێتییەکی گرنگی لایەرەکان ئەوەیە کە ئەتوانیت بیان شاریتەوە بۆ ئەوەی بتوانیت تەنها کار لەسەر یەك لایەر بکەیت. بۆ نموونە لە وێنەکەی خوارەوەدا دوو لایەرمان هەیە:**







**لایەری یەکەم، واتە ئەو لایەرەی کە لە پشت هەموو لایەرەکانی ترەوەیە بریتییە لە وێنەی کچەکە. لایەری دووەم بریتییە لە نووسینەکە. ئەگەر بمانەوێت ئیش لەسەر وێنەی کچەکە بکەین بەبێ ئەوەی نووسینەکە ڕێگریمان لێ بکات، ئەتوانین نووسینەکە بشارینەوە هەتا کارەکەمان تەواو دەبێت.**

**بۆ شاردنەوەی لایەر:**

1. **تەماشای پالێتی لایەرەکان بکە. لە لای ڕاستی هەردوو لایەرەکەدا ئەم نیشانەی چاوانە هەیە، کە ئەوە دەگەیەنن لایەرەکە دەرکەوتووە و نەشاراوەتەوە.**

2. بۆ شاردنەوەی لایەرێك، كە لێردا مەبەستمان لایەری نووسینەكەیە، كلیك لەسەر ئیشارەتی چاوەكە بكە.

3. دوای كلیك كردن ئیشارەتی چاوەكە دیار نامێنێت، كە مانای ئەوەیە لایەرەكە شاراوەتەوە.

4. ئێستا ئەتوانین بە خواستی خۆمان ئیش لەسەر وێنەكە بكەین.

## سڕینەوەی لایەرەكان

1. كلیك لەسەر لایەرێك بكە بۆ دیاریكردنی (ئاكتیڤ كردنی).




2. کلیك لەسەر ئەم تەنەکەیە بکە.





## شەفافیەت

یەکێك لە سوودەکانی لایەر بریتییە لە توانای دیاریکردنی شەفافیەتی لایەرەکە.

1. سەرەتا وێنەیەك بکەرەوە. وێنەکەی خوارەوە لە سێ لایەر پێکهاتووە. لایەری یەکەم بریتییە لە لایەرێکی شەفاف کە هیچی لەسەر نییە. لایەری دووەم بریتییە لە وێنەی منداڵەکە. لایەری سێیەم بریتییە لە چوارچێوەی وێنەکە. لایەری چوارەم بریتییە لە گوڵەکە.





2. پالیتی لایەرەکان بکەرەوە، بۆ نموونە بە کلیك کردن لەسەر ئایکۆنی پالیتەکە لە لای ڕاستی شاشەکەدا.




3. کلیك لەسەر لایەرێك بکە بۆ دیاریکردنی (ئاکتیڤ کردنی). لێرەدا کلیك لەسەر لایەری گوڵەکە دەکەین.




4. کلیك لەسەر سەهمی تەنیشت بۆکسی Opacity بکە.




5. سلایدەری Opacity ڕابکێشە و تەماشای ئەنجامی کارەکەت بکە لە وێنەکەتدا. هەتا Opacity کەمتر بێت شەفافیەت زیاتر دەبێت.




6. لە ئەنجامدا ئێستا گوڵەکە ڕەنگی کاڵترە، ڕەنگی چوارچێوەکە (کە لە پشتیەوەیەتی) تێیدا ئەبینرێت.



## پێکەوەبەستنی لایەرەکان.

ئەتوانیت کۆمەڵێك لایەر پێکەوە ببەستیت، بۆ ئەوەی کاتێك شوێنی لایەرێك ئەگوازیتەوە، لایەرەکانی تریش لەگەڵیدا بگوازرێنەوە.

1. لە وێنەکەی خوارەوەدا کۆمەڵێك ئەستێرەمان هەیە.




2. هەر یەك لە ئەستێرەکان لەسەر لایەری تایبەت بە خۆیەتی.




3. ئێستا لایەرەکانی هەموو ئەستێرەکان دیاری دەکەین، چونکە ئەمانەوێت هەموویان پێکەوە بەسترابن. بۆ دیاریکردنی هەموو لایەرەکان، کلیك لەسەر لایەرەکەی سەرەوەی هەموو لایەرەکان بکە، پاشان پەنجە لەسەر کلیلی Shift دابنێ، پاشان کلیك لەسەر لایەرەکەی خوارەوەی هەموو لایەرەکان بکە. ڕاستەوخۆ هەموو لایەرەکانی نێوان لایەرەکەی سەرەوە و خوارەوە دیاری دەبن. ئەشتوانیت لە کاتی پێویستدا پەنجە لەسەر کلیلی Ctrl دابنێیت و دانە دانە کلیك لەسەر لایەرەکان بکەیت.




4. بۆ پێکەوەبەستنی لایەرەکان، کلیك لەسەر ئەم وێنەی زنجیرە بکە.




5. ئێستا وێنەیەکی زنجیر لە تەنیشت هەموو لایەرە پێکەوەبەستراوەکانەوە دیارە، کە پێت دەڵێت ئەم لایەرە بە لایەرێکی تر یان چەند لایەرێکی ترەوە بەستراوە.



6. ئێستا کاتێك لایەری یەکێك لە ئەستێرەکان دیاریدەکەین و ئەستێرەکە دەجوولێنین، هەموو ئەستێرەکانی دی لەگەڵیدا دەجوولێن.

## تێکەڵکردن و فلاتکردنی لایەرەکان

هەتا وێنەیەك لایەری زۆرتری تێدابێت، تۆ ئەتوانیت بەشێوەیەکی ووردتر ئیشی تێدا بکەیت. بەڵام لەهەمان کاتدا، هەتا وێنەیەکی لایەری زۆرتری تێدابێت شوێنی زیاتر لەسەر هارددیسکەکەت داگیردەکات. ئەگەر هارددیسکەکەت شوێنی بەتاڵی زۆرە، کێشەمان نییە. بەڵام ئەگەر هەستت کرد کە وێنەکەت شوێنی زۆری داگیرکردووە، ئەتوانیت هەندێك لە لایەرەکانی ناو وێنەکە تێکەڵ بە یەکتر بکەیت، لەم حاڵەتەدا لەجیاتی ئەوەی دوو لایەرت هەبێت بە سیفاتی جیاوازەوە، یەك لایەرت دەست دەکەوێت کە سیفاتی هەردووکیانی لەخۆ گرتووە. فلاتکردنی وێنەیەك واتە تەخت کردنی هەموو لایەرەکان، واتە تێکەڵکردنی هەموو لایەرەکان پێکەوە، لە ئەنجامدا یەك لایەرت بۆ دروست دەبێت.




1. لە پالیتی لایەرەکاندا دوو لایەر سێلیکت بکە.




2. کلیکی ڕاست لەسەر یەکێك لە لایەرەکان بکە.




3. لە لیستەکەدا کە دەکرێتەوە کلیك لەسەر Merge Layers بکە.




دەبینیت کە هەردوو لایەرەکە بوون بە یەك لایەر.




بۆ فلاتکردنی وێنەکە:

1. لە لیستی Layer دا کلیك لەسەر Flatten Image بکە.



2. ئێستا وێنەکە لە یەك لایەرە پێکهاتووە.

## ستایڵی لایەرەکان

ئەتوانیت چەند کاریگەرییەکی جوان بۆ لایەرەکانت دابنێیت وەك سێبەر، ڕووناکی، بەرجەستەکردن، هتد. لەبەشەکانی داهاتوودا بە درێژی باسی لێ دەکەین. لێرەدا چۆنێتی کردنەوەی ستایڵەکانت پیشان دەدەین.




1. کلیکی ڕاست لەسەر لایەرێك بکە لە پالیتی لایەرەکاندا.

2. لە لیستەکەدا کە دەکرێتەوە کلیك لەسەر Blending Options بکە.




3. دایەلۆگ بۆکسی Blending Options دەکرێتەوە.




4. کلیك لەسەر تابی Styles بکە.




5. لێرەدا ئەتوانیت کلیك لەسەر ستایلێکی ئامادەکراو بکەیت بۆ لایەرەکەت. کلیك لەسەر یەکێك لە ستایلەکان بکە.




6. کلیك لەسەر OK بکە.



7. لە ئەنجامدا چوارچێوەی وێنەکەمان گۆڕانکارییەکی گەورەی بەسەردا هاتووە.




8. بۆ بەکارهێنانی ستایلی زیاتر کە لە کۆمەڵەکەدا نەبن، دوای هەنگاوی (4) کلیك لەسەر ئەم بازنەیە بکە.




9. لیستێک دەکرێتەوە. کلیک لەسەر یەکێک لەم کۆمەڵە ستایلانە بکە.




10. دوای کلیک کردن لەسەر یەکێک لە کۆمەڵە ستایلەکان، دایەلۆگ بۆکسی Layer Style دەکرێتەوە. کلیک لەسەر OK بکە.




11. ستایلەکانی ناوەڕاستی دایەلۆگ بۆکسەکە دەگۆڕێن بۆ ئەو ستایلانەی کە هەڵتبژاردن.



# بەشی سیانزەیەم

# بەکارهێنانی فیلتەر بۆ چاککردنی وێنەکانت




## فیلتەرەکانی Sharpen

یەکێك لە کێشەر بەربڵاوکانی وێنەگران بریتییە لە وێنە لێڵەکان. ئەم کێشەیەش هۆکاری زۆرە. لەوانەیە ئەو کەسەی کە وێنەی ئەگیرێت، یان وێنەگرەکە خۆی، لەکاتی وێنەگرتندا تۆزێك جووڵابن. لەوانەیە فۆکەسی کامێراکە بەچاکی دیاری نەکرابێت، یان لەوانەیە وێنەکە بە کامێرایەکی هەرزان گیرابێت کە عەدەسەکەی لەجیاتی شوشە لە پلاستیك دروستکرابێت.

ئەگەر وێنەیەك زۆر لێڵ بێت، ئەوا هیچ کارێك نییە بکرێت بۆ چاککردنی. بەڵام ئەگەر تۆزێك لێڵ بێت، ئەوا فۆتۆشۆپ ئەتوانێت بەلایەنی کەمەوە تۆزێك باشتری بکات. ئەم ئیشەش بە هەندێ فیلتەر دەکرێت کە پێیان دەوترێت فیلتەرەکانی Sharpen (شاپن، واتە تیژکردن). وەك هەموو فیلتەرەکانی تر، ئەم فیلتەرانە لە مێنیوّی Filter دان.

### ◆ Sharpen و Sharpen More

ئەم دوو ئامرازە یەك ئیش دەکەن بەڵام بە رێژەی جیاواز. ئیشیان دۆزینەوەی ئەو ناوچانەیە کە تیایاندا گۆڕانی بەرچاو لە رەنگدا روودەدەن، بۆ نموونە لێواری بابەتەکان. هەرکاتێك ناوچەیەکی وا دەدۆزرێتەوە، فۆتۆشۆپ جیاوازی نێوان رووناکی ئەم ناوچەیە و رووناکی ناوچەکانی تر زیاد دەکات، بۆ ئەوەی ئاسانتر لەیەکتر جیابکرێنەوە، لە ئەنجامدا ناوچەکە لێڵییەکەی کەم دەبێتەوە یان نامێنێت.



ئاگاداربە کە وێنەکان زۆر تیژ نەکەیت، چونکە ئەم فیلتەرانە وەك دەرمانن، تا رادەیەکی دیاریکراو سوودیان دەبێت، بەڵام ئەگەر لەوە زیاتر بخۆیت زیانت پێ دەگەیەنن.

فیلتەری Sharpen More بەنزیکی یەکسانە بە دووجار بەکارهێنانی فیلتەری Sharpen بەسەر وێنەکەدا.

ئەگەر بە یەکجار تیژکردن وێنەکە نەگەیشتە ئاستی خوازراو، ئەتوانیت Ctrl+F بکەیت بۆ ئەوەی دووبارە هەمان فیلتەر بەکاربێنیتەوە بەخێرایی.

بۆ بەکارهێنانی ئامرازی Sharpen (بەکارهێنانی Sharpen More هەر وەك Sharpen وایە، بۆیە باسی یەکێکیان دەکەین):

1. سەرەتا وێنەیەکی لێڵ بکەرەوە. تەماشای وێنەکەی خوارەوە بکە.




2. لە مێنیوی Filter
دا ماوسەکەت لەسەر
Sharpen بووەستێنە
و کلیك لەسەر Sharpen بکە.



3. وێنەکە وەك خوارەوەی لێدێت، کە زۆر جیاوازی
نییە لەگەڵ وێنە ئەسڵییەکەدا، واتە هێشتا لێڵە.



4. دوای دووجار بەکارهێنانەوەی فیلتەری
Sharpen (دووجار Ctrl+F)، وێنەکەمان
کێشەی نەما.



5. بەلاّم ئەگەر فیلتەرەکە زیاتر بەکاربێنین، وێنەکە زبر دەبێت و پاشان پەڵەپەڵە دەبێت.




## فیلتەری Sharpen Edges

ئەم فیلتەرە ئیشی تیژکردنی ڕەنگەکانی وێنەکەتە، بەلاّم تەنها کار لەسەر ئەو ڕەنگانە دەکات کە لە لێواری ئۆبجێکتەکانن.
بۆ بەکارهێنانی ئەم فیلتەرە لە مێنیوی Filter دا ماوسەکەت لەسەر Sharpen بووەستێنە و کلیك لەسەر Sharpen Edges بکە.

## Smart Sharpen

ئەم فیلتەرە کۆنترۆلّی تەواوت پێ دەدات بۆ تیژکردنی ڕەنگەکانی وێنەکەت.
بۆ بەکارهێنانی ئەم فیلتەرە:



1. وێنەیەك بکەرەوە.




2. لە مێنیوی Filter دا ماوسەکەت لەسەر Sharpen بووەستێنە و کلیک لەسەر Smart Sharpen بکە.




سەرەتا لە لیستی Remove دا یەکێک لە هەڵبژاردنەکان دیاری بکە. ئەگەر وێنەکەت تۆزێک لێڵە بەگشتی، ئەوا Gaussian Blur هەڵبژێرە. ئەگەر وێنەکەت ئاڵۆزە و ناتەوێت بابەتەکانی تر لەکاتی تیژکردنەکەدا تێک بچن Lens Blur هەڵبژێرە. ئەگەر لەکاتی وێنەگرتندا کامێراکە یان کەسی وێنەگیراو تۆزێک جووڵابوو، ئەوا Motions Blur هەڵبژێرە.




3. ئەگەر لە هەنگاوی (3) دا Motion Blur ت هەڵبژارد، بە بەکارهێنانی ئەم دوو کۆنترۆڵە گۆشەی جووڵانی کامێراکە دیاری بکە.




4. ئەگەر لە پەلەدا نیت، ئیشارەت لە بۆکسی More Accurate بدە بۆ ئەوەی فۆتۆشۆپ کاتێکی زیاتر لەگەڵ وێنەکدا بباتە سەر لەکاتی تیژکردنیدا، بۆ ئەوەی ئەنجامێکی باشترت دەست بکەوێت.




5. بە بەکارهێنانی سلایدەری Amount بڕی تیژکردنەکە دیاری بکە.




6. سلایدەری Radius بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی نیوەتیرەی ئەو ناوچەیەی کە تیژکردنەوە کاری تێ دەکات.




7. ئەگەر بە هەنگاوەکانی پێشوو تیژکردنی وێنەکەت نەگەیشتە ئاستی خوازراو، کلیك لەسەر هەڵبژاردنی Advanced بکە بەڵام ئەوە بزانە کە بەگشتی پێویستت پێی نابێت.




8. دوو تابی نوێ دەردەکەون. کلیك لەسەر تابی Shadow بکە.




9. ئەگەر ناوچەیەکی وێنەکەت زۆر تیژ بووە و ناوچەیەکی تر گۆڕانکاری کەمی بەسەردا هاتووە، سلایدەری Fade Amount بەکاربێنە بۆ یەکسانکردنی ئاستی گۆڕانکارییەکان.




10.سلایدەری Tonal Width دیاری دەکات کە هەڵبژاردنەکانی تابی Shadow تا چ ئاستێك بەسەر هەڵبژاردنەکانی تابی Sharpen دا زاڵ بن.




11.سلایدەری Radius نیوەتیری ئەو ناوچەیە دیاری دەکات کە هەڵبژاردنەکانی Shadow کاریگەری لەسەر دەکەن.




12.هەڵبژاردنەکانی تابی Highlight وەك تابی Shadow وان، بۆیە باسیان ناکەین.




13. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK.

# فیلتەرەکانی Blur

ئەم فلتەرانە بە پێچەوانەی فلتەرەکانی Sharpen ەوە ئیشیان نەرم کردن یان لێڵکردنی وێنەکان یان ناوچەیەکی دیاریکراوی وێنەکانە.

## فیلتەری Blur و Blur More



ئەم دوو فیلتەرە ئیشیان لێڵکردنی وێنەکەتە بەشێوەیەکی خێرا.

1. لە خوارەوەدا وێنەیەکمان هەیە، بەهۆی ئامرازەکانی سێلێکتکردنەوە باکگراوندی وێنەکەمان سێلێکت کردووە، کە ئەمانەوێت لێڵتری بکەین بۆ ئەوەی دوورتر دەربکەوێت.




2. لـــە مێنیـــوی Filter دا ماوسەکەت لەســــەر Blur بووەسـتێنە و کلیـك لەسەر Blur بکە.

3. بۆ زیاتر لێڵکردن، پەنجە بە Ctrl+F دا بنێ لەجیاتی دووبارە کردنەوەی هەنگاوی (2).



4. لــە ئەنجامــــدا وێنەکــــــەمان وەك خوارەوەی لێ دێت.



## Radial Blur

ئەم فیلتەرە دوو کاریگەری تایبەت لەخۆ دەگرێت. لە هەنگاوەکاندا چۆنێکی کارکردنی ئەم فیلتەرەت بۆ ڕوون دەکەینەوە.

1. وێنەیەك بکەرەوە.




2. لە مێنیوی Filter دا ماوسەکەت لەسەر Blur بوو وەستێنە و کلیك لەسەر Radial Blur بکە.




3. دایەلۆگ بۆکسی Radial Blur دەکرێتەوە. لێرەدا دوو هەڵبژاردنمان هەیە. ئەگەر Spin هەڵبژێریت وێنەکە وا دەردەکەوێت کە لە کاتی وێنەگرتندا کامێراکە سووڕابێتەوە. ئەگەر Zoom هەڵبژێریت وێنەکە وا دەردەکەوێت کە لە کاتی وێنەگرتندا کامێراکە هاتبێتە پێشەوە. سەرەتا Spin هەڵبژێرە.




4. سلایدەری Amount بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ئاستی ئیشکردنی فیلتەرەکە.




5. لێرەدا ئاستی جوانی (دیققە) ی فیلتەرەکە دیاری بکە. Draft نزمترین ئاستە و Best بەرزترین ئاست. ئاستی بەرز کاتی زیاتری پێدەچێت لەکاتی دانانی فیلتەرەکەدا، بەتایبەتی ئەگەر وێنەکەت گەورە بێت.




6. کلیك لەسەر OK بکە بۆ ئەنجامدانی فیلتەرەکە.



7. لە ئەنجامدا وێنەکە وەك خوارەوەی لێ دێت:




8. ئەگەر لە هەنگاوی (3) دا کلیك لەسەر Zoom بکەیت:



9. وێنەکەمان وەك خوارەوەی لێ دێت.






# Motion Blur

کاتێك ئەم فیلتەرە لەسەر وێنەیەك دادەنێیت، وێنەکە وا دەردەکەوێت کە لەکاتی وێنەگرتندا کامێراکە جوولاَبێت، وەك لە نموونەکەی خوارەوەدا دیارە.




بـــۆ دانــــانی ئـــەم فیلتەرە،

1. لـــە مێنیـــوی Filter دا ماوسەکەت لەســـــەر Blur بووەســـتێنە و کلیــك لەســـەر Motion Blur بکە.




2. ئەم دوو دوگمەیە بەکاربێنە بۆ گەورە و بچووککردنی نموونەکە.




3. لێرەدا گۆشەی جووڵانی کامێراکە دیاری بکە.




4. لێرەدا ئەو دوورییە دیاری بکە کە کامێراکە دەیبڕێت، واتە بڕی جووڵانی کامێراکە.




5. کلیك لەسەر OK بکە.



6. لە ئەنجامدا وێنەکەمان وەك خوارەوەی لێ دێت.

## بەشی چواردەیەم

# بەکارهێنانی تێکست و کاریگەرییە تایبەتییەکانی




## دەستکردن بە نووسین

لێرەدا لە چەند هەنگاوێکی سادەدا بەکارهێنانی ئامرازی تایپت پیشان دەدەین:

1. وێنەیەکی نوێ دروستبکە بە باکگراوندێکی سپی یان هەر ڕەنگێکی تر.
2. لە تووڵبۆکسی فۆتۆشۆپدا کلیك لەسەر ئامرازی تایپ بکە.




3. لە ئۆپشنزباڕدا بۆ دیاریکردنی فۆنتی نووسین کلیك لەسەر ئەم سەهمە سەربەرەوخوارە بکە.




4. سەرەتا ئامرازەکە ئامادە دەکەین. لیستی فۆنتەکانت بۆ دەکرێتەوە. لێرەدا ئەتوانیت نموونەیەك لە دیمەنی فۆنتەکە تەماشا بکەیت.




5. بۆ هەڵبژاردنی فۆنتێك، كلیك لەسەر ناوی فۆنتەكە یان نموونەكەی بكە.




6. لەم لیستەدا ئەتوانیت هەندێك هەڵبژاردنی تایبەت بە نووسین دیاری بكەیت، وەك ئاسایی، ئیتالیك یان بۆڵد. ژمارەی هەڵبژاردنەكان بەپێی فۆنت دەگۆڕێت، هەندێك فۆنت تەنها دەكرێت ئیتالیكی بێت، هەندێكی تر ئیتالیك یان بۆڵد، هتد.




7. لێرەدا قەبارەی فۆنتەكە دیاری بكە.

8. لەم لیستەدا شێوازی Anti-aliasing ی نووسینەكە دیاری بكە. ئەم هەڵبژاردنانە ئەتوانن نووسینەكەت جوانتر بكەن بۆ ئەوەی بە ئاسانی بخوێنرێتەوە، بەتایبەتی ئەگەر وێنەكەت بۆ لاپەڕەیەكی ئینتەرنێتە. هەڵبژاردنی None هیچ گۆڕانكارییەك ئەنجام نادات. هەڵبژاردنەكانی تر تاقی بكەرەوە و تەماشای شێوەی كاركردنیان بكە.






9. لێـــــرەدا شـــــێوازی هەڵکـــەوتنی نووســـینەکەت دیـــاری بکـــە، چـــەپ، ناوەڕاست یان ڕاست.

10.بۆ دیاریکردنی ڕەنگی نووسین، سەرەتا کلیك لەسەر ئەم بۆکسە بکە.







11.دایەلۆگ بۆکسی Text Color ئەکرێتەوە، ڕەنگێك هەڵبژێرە.




12.کلیك لەسەر OK بکە.




**13.ئێستا کلیك لەسەر شوێنێکی وێنەکەت بکە.**




**14.ئەم هێڵە باریکە دەردەکەوێت کە دەکوژێتەوە و دادەگیرسێت، ئەمە مانای ئەوەیە ئەتوانیت دەست بکەیت بە نووسین.**




**15.شتێك بنووسە.**




16. دوای نووسین، بۆ سێلێکت کردنی نووسینەکە، کلیك لەسەر سەرەتای نووسینەکە بکە، پاشان بەبێ پەنجە هەڵگرتن لەسەر کلیك ماوسەکەت ڕابکێشە بۆ کۆتایی نووسینەکە، پاشان پەنجە لەسەر کلیك هەڵبگرە.




17.دوای سێلێکتکردنی نووسینەکە، ئەتوانیت بە بەکارهێنانی ئۆپشنزباڕ دووبارە بە خواستی خۆت دەستکاری دیمەنی نووسینەکە بکەیت.




18.بۆ گۆڕینی وێنەکە لە ئاسۆییەوە بۆ ستوونی، کلیك لەسەر ئەم دوگمەیە بکە.



## چەماندنەوەی نووسین




1. نووسینێك سێلێکت بکە.




2. کلیك لێرە بکە.




3. دایەلۆگ بۆکسی Warp Text دەکرێتەوە. کلیك لێرە بکە.




4. لەم لیستەدا کلیك لەسەر یەکێك لە شێوازەکانی چەمانەوە بکە.




5. لێرەدا دیاری بکە ئایا چەمانەوەکە بە شێوەیەکی ئاسۆیی (Horizontal) ئەنجام بدرێت یان بەشێوەیەکی ستوونی (Vertical).




6. سلایدەری Bend بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ئاستی چەمانەوەی نووسینەکە.




7. ئەتوانیت سلایدەری Horizontal Distortion بەکاربێنیت بۆ ئەوی لایەکی نووسینەکە لە لاکەی تر ئەستوور تر بێت.

Infinite

پێش هەنگاوی (7):

Infinite

دوای هەنگاوی (7):




8. ئەتوانیت سلایدەری Vertical Distortion بەکاربێنیت بۆ ئەوەی سەرەوەی نووسینەکە لە خوارەوە ئەستوورتر بێت یان بە پێچەوانەوە.




9. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.




10. لە ئەنجامدا نووسینەکەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت.

## دانانی فیلتەر لەسەر نووسین

پێش ئەوەی بتوانیت فیلتەرێك لەسەر نووسینەکەت دابنێیت، پێویستە لایەری نووسینەکە ڕاستەرایز بکەیت (Rasterize). بەهۆی ئەم کردارەوە ئەو لایەرەی کە نووسینەکەی لەسەرە دەبێت بە وێنە، بۆ ئەوەی فیلتەرەکان بتوانن کاری لەسەر بکەن. دوای ئەوەی لایەرێکی نووسین ڕاستەرایز دەکەیت ناتوانیت دووبارە بە ئامرازی تایپ دەستکاری نووسینەکە بکەیت. نووسینەکە دەبێت بە وێنە و تۆش هەر وەکو وێنە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەیت. ئەتوانیت بە خواستی خۆت فلچەی لەسەر بەکاربێنیت.




1. بۆ ڕاستەرایز کردنی لایەری نووسینەکە، سەرەتا نووسینەکە سێلێکت بکە. (ئەتوانیت لە پالیتی لایەرەکاندا کلیك لەسەر لایەری نووسینەکە بکەیت.)




2. مێنیوی Layer دا ماوسەکەت لەسەر Rasterize بووەستێنە و کلیك لەسەر Type بکە.

3. ئێستا ئەتوانیت فیلتەر لەسەر نووسینەکە دابنێیت.

# دانانی ستایڵ لەسەر نووسین

بەپێچەوانەی فیلتەرەوە، دانانی ستایڵ لەسەر نووسین پێویستی بە راستەرایزکردن نییە. ئەتوانیت دوای دانانی ستایڵەکەت دەستکاری نووسینەکەت بکەیت.




1. نووسینەکەت سێلێکت بکە، یان کلیك لەسەر لایەری نووسینەکە بکە.




2. کلیك لەسەر ئایکۆنی پالیتی ستایڵز بکە. ئەگەر ئایکۆنەکەت بۆ نەدۆزرایەوە تەماشای هەنگاوی (3) بکە.






3. لە مێنیوی Window دا کلیك لەسەر Styles بکە.




4. کلیك لەسەر یەکێك لە ستایڵەکان بکە و تەماشای ئەنجامەکەی بکە لەسەر نووسینەکەت.




5. بۆ بەکارهێنانی کۆمەڵێك ستایلی دیکە لەجیاتی ئەو کۆمەڵەیەی کە لە پالیتەکەدا پیشان دراون، سەرەتا کلیك لێرە بکە.




6. لە لیستەکەدا کلیك لەسەر کۆمەڵە ستایڵێکی تر بکە.



## دانانی سێبەر بۆ نووسین

سوودی سێبەر لە پشتی نووسینێکەوە ئەوەیە کە نووسینەکە لەبەرچاوی خوێنەر دەهێنێتە پێشەوە و سەرنجی رادەکێشێت. سێبەر بەشێکە لە ستایڵەکان، لەبەر ئەمە پێویستە بە
ڕاستەرایزکردنی وێنەکە ناکات.

THE FALLEN ANGEL

1. نووسینێك بکەرەوە.

2. پالیتی لایەرەکان بکەرەوە.







3. کلیك لەسەر ئەو لایەرە بکە کە نووسینەکەی تێدایە.




4. کلیك لەسەر دوگمەی *fx* بکە.




5. لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Drop Shadow بکە.

6. دایەلۆگ بۆکسی Layer Style دەکرێتەوە و تیایدا تابی Drop Shadow ئاکتیڤە.

7. بە کلیك کردن لەسەر ئەم لاکێشەیە رەنگی سێبەرەکە دیاری بکە.

8. لەم لیستەدا جۆری تێکەڵبوونی رەنگی سێبەرەکە لەگەڵ رەنگەکانی دیکەدا دیاری بکە. لە رابردوودا باسی جۆرەکانی تێکەڵبوون ( Blending Options) مان کرد.



9. سلایدەری Opacity بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ئاستی شەفافیەت (یان تۆخی) وێنەکە.



10. لێرەدا گۆشەی بەرکەوتنی تیشك دیاری بکە.



11. سلایدەری Distance بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی دووری نێوان نووسینەکە و سێبەرەکەی.




12. ئەم سلایدەرە ئاستی بڵاوبوونەوەی سێبەردکە دیاری دەکات.




13. سلایدەری Size بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی ڕووبەری سێبەرەکە (گەورە و بچووکی سێبەرەکە).




14. بە کلیك کردن لەسەر ئەم سیگۆشە سەربەرەوخوارە لیستەکەت بۆ دەکرێتەوە. لێرەدا ئەتوانیت چەند کاریگەرییەکی جیاواز هەڵبژێریت بۆئەوەی بەسەر سێبەرەکەدا ئەنجام بدرێن.




15

15. ئەتوانیت بە بەکارهێنانی سلایدەری Noise سێبەرەکە زبر بکەیت.

16




16. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.

17. لە ئەنجامدا نووسینەکەمان وەك خوارەوەی لێ دێت. ئەتوانیت تەماشای هەنگاوی (1) بکەیت و بەراورد لە نێوان نووسینەکەی سەرەتا و نووسینەکەی ئێستا بکەیت.

17

THE FALLEN ANGEL

## پالیتەکانی کاراکتەر و پاراگراف

ئەم دوو پالیتە کۆنترۆڵی زیاترت پێ دەبەخشن بەسەر دیمەن پیتەکان و ڕستەکان. زۆربەی فەرمانەکانی ئێرە هەر وەك بەرنامەکانی وێرد پاد و مایکرۆسۆفت ووِرد وان، بۆیە بە قووڵی باسیان ناکەین.

1. بۆ کردنەوەی پالیتی کاراکتەر، لە مێنیوی Window دا کلیك لەسەر Character بکە.






2. پالیتی کاراکتەر دەکرێتەوە. بۆ هێڵبەژێرداهێنانی نووسین (ئەندەرلاین)، ئەم دوگمەیە بەکاربێنە.




3. بۆ کردنەوەی پالیتی پاراگراف، هەر لە پالیتی کاراکتەردا کلیك لەسەر تابی Paragraph بکە.

## پڕکردنەوەی نووسین بە وێنە

تەماشای نووسینەکەی خوارەوە بکە، نووسراوە Clouds، واتە هەورەکان. لەناو پیتەکاندا وێنەی هەور دەبینیت. لە لاپەڕەی داهاتوودا باسی چۆنێتی پڕکردنەوەی نووسین بە وێنە دەکەین.







1. کلیکی ڕاست لەسەر ئامرازی تایپ بکە.




2. لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Horizontal Type Mask Tool بکە.



3. وێنەیەك بکەرەوە.

4. فۆنتێك هەڵبژێرە، فۆنتەکە فۆنتێکی ئەستوور بێت باشە، بۆ ئەوەی بڕێکی زۆرتر لە وێنەکە تێیدا دەرکەوێت.

5. بۆ ئەستوورتر کردنی فۆنتەکە، تەنانەت ئەگەر فۆنتەکە بۆڵدی لەگەڵدا نەبێت، کلیك لەسەر ئایکۆنی پالیتی کاراکتەر بکە.




6. کلیك لەسەر دوگمەی Faux Bold بکە.





7. ئێستا شوێنێکی وێنەکە هەڵبژێرە بۆ دەستکردن بە نووسین. کلیك بکە.



8. وێنەکە دادەپۆشرێت بە ڕەنگێکی نوێ. نووسینەکەت بنووسە.




9. دوای تەواوبوون لە نووسین کلیك لەسەر ئامرازێکی تر بکە، بۆ نموونە ئامرازی گواستنەوە (Move Tool).



10. دەبینیت کە نووسینەکەت دەبێت بە ناوچەیەکی سێلێکت کراو لە وێنەکە.



11.ئەگەر ویستت نووسینەکە (ناوچە سێلێکتکراوەکە) بجووڵێنیت، سەرەتا کلیك لەسەر ئامرازێکی سێلێکتکردن بکە، بۆ نموونە ئامرازی مارکی لاکێشەیی.



12.ماوسەکەت لەسەر ناوچە سێلێکت کراوەکە بووەستێنە هەتا ئیشارەتی ماوسەکە دەبێت بە سەهمێك و لاکێشەیەکی بچووك لە ژێریدا.



13.ئێستا ئەتوانیت نووسینەکە بجووڵێنیت بە خواستی خۆت.

14.کاتێك شوێنەکەیت بەدڵ بوو، ئەتوانیت لە مێنیوی Edit دا کلیك لەسەر Copy بکەیت (یاخود Ctrl+C) بۆ کۆپی کردنی نووسینەکە.






15. ئەتوانیت لە وێنەیەکی دیکەدا Ctrl+V بکەیت بۆ دانانەوەی نووسینەکە.
لەخوارەوەدا لە وێنەیەکی بەتاڵدا نووسینەکەمان داناوەتەوە.




16. ئەشتوانیت دوای هەنگاوی (13) پەنجە بە کلیلی Delete دا بنێیت، ئەنجامەکەش پێچەوانەی پێشوو دەبێت، هەر ڕەنگێك لە پشتەوە بێت دەردەکەوێت. لێرەدا ڕەنگی سپی لە پشتەوەی وێنەی گوڵەکانەوەیە، بۆیە نووسینەکە بە سپی دەرکەوتووە. ئەگەر وێنەیەکی تر لە پشت وێنەی گوڵەکانەوە بوایە ئەوا وێنەکەی تر دەردەکەوت.

## ڕووناککردنەوەی نووسین

سوودی ڕووناککردنەوە ئەوەیە کە نووسینەکە جیادەکاتەوە لە باکگراوندەکە، بۆیە بە ئاسانی دەبینرێت و دەخوێنرێتەوە.
بۆ نموونە لە وێنەکەی خوارەوەدا نووسینێکمان هەیە لە سووچی چەپی سەرەوەدا:




لەبەر ئەوەی ڕەنگی نووسینەکە نزیکە لە ڕەنگی وێنەکەی پشتەوە، نووسینەکە بە جوانی دیار نییە.




دوای دانانی ڕووناککردنەوەی ناوەکی بۆ نووسینەکە:

ئەم جۆرە ڕووناککردنەوەیە سنووری ناوەوەی نووسینەکە ڕووناك دەکاتەوە.




دوای دانانی ڕووناککردنەوەی دەرەکی بۆ نووسینەکە:
ئەم جۆرە ڕووناککردنەوەیە کار لە دەرەوەی سنووری نووسینەکە دەکات.




## دانانی ڕووناککردنەوە
## Glow

1. وێنەیەك بکەرەوە کە نووسینێکی تێدا بێت.




2. لە پالیتی لایەرەکاندا کلیك لەسەر دوگمەی *fx* بکە.

3. لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Outer Glow بکە.




4. دایەلۆگ بۆکسی Layer Style دەکرێتەوە. Blend Mode بکە بە Normal.




5. کۆنترۆڵەکانی تر بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی سیفاتەکانی تری ڕووناککردنەوەکە. ئەتوانیت تەماشای بابەتی دانانی سێبەر بکەیت بۆ تێگەشتن لەم کۆنترۆڵانە.






6. بۆ دانانی ڕووناککردنەوەی ناوەکی، سەرەتا کلیك لەسەر تابی Inner Glow بکە.




7. یاخود نیشانەت لە بۆکسی Inner Glow بدە.




8. لێرەشدا کۆنترۆڵەکان بەکاربێنە بۆ دیاریکردنی دیمەنی ڕووناککردنەوەکە. تەماشای نووسینەکەت بکە لە کاتی جووڵاندنی سلایدەرەکان بۆ بینینی ئەنجامی کارەکەت.




9. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.




10. لە ئەنجامدا:

## بێڤێل و ئیمبۆس

THE STORM

کاریگەرییەکانی بێڤێل و ئیمبۆس لە دایەلۆگ بۆکسی Layer Style دان. بێڤێل ناوەوەی نووسینەکە بەرز دەکاتەوە و ئیمبۆس شێوەیەکی قەبارەداری پێ دەبەخشێت. وەك نووسینەکەی خوارەوە:




بۆ دانانی بێڤێل و ئیمبۆس:

1. لە دایەلۆگ بۆکسی Layer Style دا کلیك لەسەر Bevel and Emboss بکە. بۆ شێوازی کردنەوەی دایەلۆگ بۆکسەکە تەماشای بابەتی ڕابردوو بکە.




2. لێرەدا جۆری کاریگەرییەکە دیاری بکە.

3. کۆنترۆڵەکانی تر تاقی بکەرەوە و تەماشای ئەنجامیان بکە لە نووسینەکەتدا.

4. لە کۆتاییدا کلیك لەسەر OK بکە.

# بەشی پانزەیەم

# چاک کردنەوەی وێنەی ڕەش و سپی

## چەند چاککارییەکی ئاسان

هەندێک وێنە پێویستیان بە چاککاری کەمتر هەیە وەك لە وێنەی تر. ئێمە سەرەتا بە وێنەکەی خوارەوە دەست پێ دەکەین کە چەند کێشەیەکی تێدایە.



سەرەتا، بۆ لابردنی سووچە ناڕێکەکان، بە بەکارهێنانی ئامرازی Crop چوارچێوەی وێنەکە دەقرتێنین.





وێنەکەمان وەك خوارەوەی لێ دێت.




پاشان مۆدی وێنەکە دەکەین بە Grayscale، چونکە وێنەکە لە ئەسڵدا ڕەش و سپییە بەڵام بەهۆی کۆنییەوە چەند پەڵەیەکی زەرد و قاوەیی تێدا دەرکەوتووە. مۆدی Grayscale هەموو ڕەنگەکان دەکاتەوە بە ڕەش و سپی.



پاشان بە بەکارهێنانی Curves، کەمێك دەستکاری کۆنتراستی وێنەکە دەکەین. Curves ڕێگەمان پێ دەدات ناوچە ڕووناکەکان ڕووناکتر بکەین بەبێ ئەوەی ناوچە تاریکەکان گۆڕانکارییان بەسەردا بێت.





لە ئەنجامدا وێنەکەمان وەك ئەم وێنەیەی لێدێت. ئێستا زیاتر دیاری کە خانمەکە پشیلەیەکی ڕەش بەدەستەوەیە.



پاشان بە بەکارهێنانی ئامرازی Clone Stamp، پەڵەکانی سەر وێنەکە لادەبەم. ئامرازی Clone Stamp ڕەنبگی ناوچەیەك وەردەگرێت و وەك فڵچەیەك بەکاری دەهێنێت. سەرەتا کلیك لەسەر ئامرازی Clone Stamp دەکەین.







پاشان پەنجە بە کلیلی Alt دا دەنێین و بەبێ پەنجە هەڵگرتن لەسەر کلیلی Alt، کلیک لەسەر ئەو شوێنە دەکەین لە وێنەکەدا کە ئەمانەوێت ڕەنگەکەی لێ وەرگرین.





پاشان کلیک لەسەر پەڵەکە دەکەین.



دوای لابردنی پەڵە گەورەکان، فیلتەری Sharpen بەکاردەهێنین بۆ ئەوەی وێنەکە لێڵییەکەی کەمتر بکەینەوە.





دوا کار کە ئەنجامی دەدەین بریتییە لە بەکارهێنانی فیلتەری Dust & Scratches بۆ لابردنی ئەو پەڵە و ناوچە ڕووشاوانەی کە لە وێنەکەدا ماون. سەرەتا لە مێنیوی Filter دا ماوسەکەمان لەسەر Noise دەوەستێنین و کلیك لەسەر Dust & Scratches دەکەین.







دایەلۆگ بۆکسی Dust & Scratches دەکرێتەوە. نرخی Radius دەکەین بە 1 و دەستکاری Threshold ناکەین (بۆ وێنەی تر لەوانەیە پێویست بکات نرخەکان بگۆڕیت).




کلیك لەسەر OK دەکەین.

لە ئەنجامدا، وێنەکەمان باشتر بووە.

| پێش چاککردن | دوای چاککردن |
|---|---|





ئەمەش وێنەیەکی ترە کە تا ڕادەیەك کۆنە، لە ساڵی 1948 دا گیراوە. ئەم وێنەیە کێشەی زۆر زیاترە لە وێنەکەی پێشوو. وێنەکە لێڵە و کۆنتراستی زۆرە، لە چەند شوێنێکیشدا شکاوە. ناوچە ڕەشەکان ڕەنگیان لە سەوز دەچێت تا ڕەش، وێنەکەش شتێکی پیا ڕژاوە.



سەرەتا بە قرتاندنی چوارچێوەی وێنەکە بە بەکارهێنانی ئامرازی Crop دەست پێ دەکەین.




ئێستا دایەلۆگ بۆکسی Levels بەکاردەهێنین بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەنگەکان. ئەم سێ سلایدەرە دەجوولێنین و تەماشای کاریگەرییەکەی دەکەین لەسەر وێنەکە، هەتا ئەنجامێکی باشمان دەست دەکەوێت.





دوای چاککردنی ڕەنگی وێنەکە، ئێستا کاتی چاککردنەوەی پەڵە و شکانەکانە. بۆ ئەم مەبەستە ئامرازی Clone Stamp بەکاردەهێنین وەك لە وێنەکەی پێشوودا باسمان کرد.

لە ئەنجامدا وێنەکەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت. ئەکرێت وێنەکە ئیشی زیاتر تێدا بکرێت.

## ئامرازی Healing Brush و Spot Healing Brush

ئامرازی Healing Brush (واتە فڵچەی شیفا دان یان چاککردنەوە) یەکێکە لە ئامرازە گرنگەکان بۆ چاککردنەوەی وێنە. ئیشی ئەم ئامرازە لە ئامرازی Clone Stamp دەچێت، تۆ ناوچەیەك دیاری دەکەیت و ڕەنگی ئەو ناوچەیە بەکاردەهێنیت بۆ پڕکردنەوەی ناوچەیەکی تر. بەڵام جیاوازی Healing Brush ئەوەیە کە ڕەنگی ناوچەیەك وەردەگرێت کە تۆ دیاری دەکەیت، پاشان تەماشای ڕەنگی ئەو ناوچەیە دەکات کە دەتەوێت پڕی بکەیتەوە و ڕەنگی ئەو ناوچەیە بەراورد دەکات لەگەڵ ڕەنگی ناوچەکانی دەوروبەر، پاشان دوای ئەنجامدانی چەند کردارێکی حسابی، ڕەنگە نوێکە دادەنێت. لە ئەنجامدا کاریگەری Healing Brush شێوەی ڕاستەقینەی وێنەکە زیاتر دەپارێزێت و گۆڕانکارییەکە کەمتر هەستی پێ دەکرێت.

لە خوارەوەدا وێنەی برادەرێکمان داناوە، لە وێنە ئەسڵییەکەدا هەندێك تاڵە موو هاتبوون بەسەر تەوێڵیدا و تەوێڵی ئارەقی پێوە بوو، لە لای چەپدا بە بەکارهێنانی ئامرازی Clone Stamp چارەسەری کێشەکەمان کردووە. لە لای ڕاستدا بە بەکارهێنانی ئامرازی Healing Brush. دەبینیت کە وێنەکەی لای ڕاست جوانترە و زیاتر لە ڕاستییەوە نزیکە.







بۆ بەکارهێنانی ئامرازی Healing Brush کلیکی ڕاست لەسەر ئامرازی Spot Healing Brush بکە.



پاشان لە لیستەکەدا کلیك لەسەر Healing Brush Tool بکە.







دوای هەڵبژاردنی ئامرازەکە، هەر وەك ئامرازی Clone Stamp بەکاری بێنە.

ئامرازی Spot Healing Brush وەك ئامرازی Healing Brush وایە، بەڵام پێویستی بە هەڵبژاردنی ناوچەیەك نییە کە ڕەنگی لێوە وەر بگرێت، بەڵکو ئامرازەکە خۆی تەماشای ڕەنگەکانی دەوروبەر دەکات و ناوچەکەی پێ پڕ دەکاتەوە. بۆ هەڵبژاردنی ئەم ئامرازە، لە لیستەکەی سەرەوەدا کلیك لەسەر Spot Healing Brush Tool بکە.

# خۆ ڕزگارکردن لە باکگراوندی نا ڕێکوپێک



لە خوارەوەدا وێنەیەکی کۆنمان هەیە. ناوچەکانی نزیك چوارچێوەی وێنەکە کاڵ بوونەتەوە و دیمەنێکی نەخوازراویان بە وێنەکە بەخشیوە.

بۆ خۆ ڕزگارکردن لە باکگراوندەکە:

1. ئامرازی مارکی هێلکەیی هەڵبژێرە.









2. وێنەکە سێلێکت بکە. دڵنیا بکەرەوە لەوەی کە دەم و چاوی مامەپیرە هەمووی لەناو ناوچە سێلێکت کراوەکەدا بێت.




3. لە مێنیوی Select دا ماوسەکەت لەسەر Modify بووەستێنە و کلیك لەسەر Feather بکە.




4. دایەلۆگ بۆکسی Feather Selection دەکرێتەوە، ژمارەیەك داخڵ بکە. ئەگەر دەرەنجامی ئەم ژمارەیەت بەدڵ نەبوو لە کۆتایی کارەکەتدا، ژمارەیەکی تر تاقی بکەرەوە.




5. ئێستا کلیکی ڕاست لەسەر ناوچە سێلێکت کراوەکەی وێنەکە بکە و کلیك لەسەر Select Inverse بکە.




6. دوا هەنگاو بریتییە لە سڕینەوەی باکگراوندەکە. لە لیستی Edit دا کلیك لەسەر Clear بکە، یاخود پەنجە بە کلیلی Delete دا بنێ لەسەر کیبۆڕدەکەت.

Ps
ADOBE® PHOTOSHOP® CS3



7. لە ئەنجامدا، وێنەکەمان وەک خوارەوەی لێ بەسەر دێت.



ئێمە ئەم ئەنجامەمان بەدڵ نەبوو. بۆیە سەر لە نوێ دەستمان پێ کردەوە و ئەم جارە ناوچەیەکی زیاترمان سیلێکت کرد و نرخی Feather مان کەمتر کردەوە. لە ئەنجامدا وێنەی لاپەڕەی داهاتوومان دەست کەوت.

# بەشی شانزەیەم

# چاککردنەوەی ووێنەی ڕەنگاوڕەنگ

## چاککردنی ڕەنگ



زۆر جار وێنەیەکت دێتە دەست کە بەهۆی کۆنی، یان بەهۆی کێشەیەک لە کاتی وێنەگرتن یان چاپکردندا، ڕەنگێک زاڵە بەسەر وێنەکەدا، بۆ نموونە لەگەڵ ئەوەی وێنەکە ڕەنگاوڕەنگە، هەموو بابەتەکان ڕەنگی زەردیان تێدایە، هەموو وێنەکەش زەرد زاڵە بەسەریدا. هەندێک جاریش ڕەنگەکان بەگشتی گۆڕانیان بەسەردا هاتووە و شێوەیەکی نەخوازراویان بە وێنەکە بەخشیوە. لە خوارەوەدا وێنەیەکمان هەیە کە لە نەوەدەکاندا گیراوە. وێنەکە چەند کێشەیەکی تێدایە کە هەنگاوە بە هەنگاو چارەسەریان دەکەین.




1. یەکەم کێشە کە چارەسەری بکەین بریتییە لە تاریکی وێنەکە. لە مێنیوی Image دا ماوسەکەمان لەسەر Adjustments دەوەستێنین و کلیك لەسەر Brightness/Contrast دەکەین.




2. لەگەڵ زیادکردنی ڕووناکی (Brightness) دا بۆمان دەردەکەوێت کە وێنەکە کۆنتراستی زۆرە، بۆیە کۆنتراست کەمێك کەم دەکەینەوە.



3. لە ئەنجامدا وێنەکەمان زۆر ڕوونترە.




4. هەنگاوی ئەم جارەمان بریتییە لە قرتاندنی چوارچێوەکە بە بەکارهێنانی ئامرازی Crop.



5. ئێستا وێنەکەمان چوارچێوەیەکی ڕێك و پێکی هەیە.



6. دەبینیت کە لە سووچی چەپی سەرەوەی وێنەکەدا، ڕەنگی ئاسمانەکە کەمێك کاڵترە لە ڕەنگی ئاسمانی ناوچەکانی تر، لەوانەیە شتێك بە سەر وێنەکەدا ڕژابێت لە ئەو شوێنەدا.




7. ئامرازی Healing Brush بەکاردەهێنین بۆ وەرگرتنی ڕەنگی ناوچەیەکی تر. سەرەتا کلیك لەسەر ئامرازی Healing Brush دەکەین. ئامرازێکی ترمان هەیە پێی دەوترێت Spot Healing Brush کە لێرەدا کارمان پێی نییە، وێنەی ئامرازی Spot Healing Brush نزیکە لە وێنەی ئامرازی Healing Brush ، بۆیە دیققەتی وێنەکە بدە. ئەگەر وێنەکە وەك خوارەوە نەبوو، کلیکی ڕاستی لەسەر بکە پاشان ئامرازی Healing Brush هەڵبژێرە.



8. ئێستا پەنجە لەسەر کلیلی Alt دادەنێین و کلیك لێرە دەکەین لە ئەسمانەکەدا، بۆ وەرگرتنی ڕەنگی ئەم ناوچەیە.



9. پاشان ماوسەکە ڕادەکێشین بەسەر ناوچە کاڵەکەدا. دەبینیت کە ئێستا ناوچە کاڵەکە نەماوە.

10. ئێستا کاتی گرنگترین نیش هاتووە، ئەویش ڕاستکردنەوەی ڕەنگەکانە. ئاسمانی وێنەکەمان زیاتر سەوزە تا شین، ڕەنگی بەردەکان و دەم و چاوی بەبەکەمان زەردن. بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەنگەکان دایەلۆگ بۆکسی Color Balance بەکاردەهێنین.

11. بە بەکارهێنانی ئەم سێ سلایدەرە بە جیا بۆ هەر یەکێك لە هەڵبژاردنەکانی Shadows، Midtones لەگەڵ Highlights و تەماشا کردنی ئەنجامی کارەکەمان لەسەر وێنەکە، ڕەنگەکانی وێنەکە نزیکتر دەکەینەوە لە ڕاستی.



12.لە ئەنجامدا وێنەکەمان ڕەنگەکانی زۆر لە ڕاستییەوە نزیکترن. هەرچەندە دەکرێت بەهۆی چاپی ڕەش و سپی کتێبەکەوە جیاوازییە گەورەکە نەبینیت.




13.ئێستا ڕەنگی وێنەکەمان تا ڕادەیەك بەدڵە، بەڵام هێشتا کێشەی تیادا ماوە. یەکێك لە کێشەکان بریتییە لە زبری وێنەکە. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە فیلتەری Despeckle بەکاردەهێنین.




14.ئێستا وێنەکەمان زبری کەمتر بووەتەوە. بە بەکارهێنانی ئامرازی Blur ئیش لەسەر دەم و چاوی منداڵەکە دەکەین بۆ کەمترکردنەوەی زبر.




15. فرمانی Autocolor ی فۆتۆشۆپ بەکاردەهێنین بۆ ڕاستکردنەوەی ڕەنگەکان. ئەم فرمانە بە شێوەیەکی ئەوتۆماتیکی کار دەکات و هەندێك جار ئەنجامی زۆر باش بەدەستەوە دەدات.

16. لە ئەنجامدا، ژیانێکی نوێمان بە وێنەکە بەخشی.

**پێش چاککردن:**



**دوای چاککردن**



## چاککردنی چاوی سوور




بە لایەنی کەمەوە تۆ چەند وێنەیەکت دیوە کە تیایدا مرۆڤەکان یان گیاندارەکان چاویان سوورە. هۆکاری ئەم کێشەیە بریتییە لەوەی کە تیشکی فلاشی کامێراکە بەر ڕەگەکانی خوێن دەکەوێت کە لە پشتەوەی چاون و دەگەڕێتەوە بەناو بیلبیلە (pupil) ی چاودا و ڕەنگێکی سوور دەبەخشێت بە ناوچەکە. ئەتوانیت خۆت لەم کێشەیە بپارێزیت بە دڵنیاکردنەوە لەوەی کە ئەو کەسە یان گیاندارەی کە وێنەی دەگریت تەماشای فلاشەکە نەکات. هەروەها پێویستە شوێنی وێنەگرتنەکە بەباشی ڕووناککرابێتەوە بۆ ئەوەی بیلبیلەی چاوەکان تا بکرێت بچووك ببنەوە. ئامرازێکمان هەیە پێی دەوترێتی ئامرازی Red Eye کە بەکاردێت بۆ چاککردنی چاوی سوور.



**لە خوارەوەدا وێنەی ئەم کچەمان هەیە کە چاوەکانی سوور دەرچوون، لە ئەنجامیشدا شێوەیەکی ترسناکیان بەخشیوە بە چاوە جوانەکانی.**

**دوای هەڵبژاردنی ئامرازی Red Eye، یەکە بە یەکە کلیك لە ناوەڕاستی هەردوو چاوی دەکەین.**






**فۆتۆشۆپ ڕەنگی چاوەکانیمان بۆ دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕەنگی ئاساییان.**





## جوانکاری بۆ چاو

لێرەدا باسی پرۆسەیەک دەکەین بۆ جوانکردنی چاوی کەسێک. پێویستە چاوی کەسەکە بە ڕوونی و بە گەورەیی لە وێنەکەدا دیار بێت، ئەگەر وا نەبێت ئەوا کارەکە ئاسان نابێت و ئەنجامەکەش باش دەرناچێت.

1. ئێمە کار لەسەر وێنەی ئەم خانمە ڕووخۆشەی خوارەوە دەکەین.



2. لە تووڵبۆکسەکەدا ئامرازی Dodge هەڵبژێرە.




3. ئاستی Exposure بکە بە ٪50، ئەگەر کەسەکە چاوی کاڵە ئەوا با لە ٪50 کەمتر بێت.




4. یەکێک لە چاوەکانی کەسەکە بهێنەرە پێشەوە و ئامرازەکەی لەسەر بووەستێنە. پێویستە قەبارەی ئامرازەکە وەک ئامرازەکەی ناو وێنەکەی خوارەوە وابێت، ئەگەر لەوە گەورەترە بچووکی بکەرەوە و ئەگەر بچووکترە گەورەی بکە. لە خوارەوەدا بازنەیەکی سپیمان لە شوێنی ئامرازەکەدا داناوە بۆ ئەوەی بتوانیت قەبارەی ئامرازەکە ببینیت.




.5 ئێــــــستا دەست بکە بە بەکارهێنانی ئامرازەکە لەسەر چاوەکە. ئێمە لە خوارەوەدا بە ڕەنگی سپی ئەو ناوچەیەمان دیاری کردووە کە ئەبێت ئامرازەکـــەی بەســـەردا بهێنیـــت. دوو ســـەهمەکەش شـــێوازی جووڵانـــدنی ئامرازەکەت پێ پیشان دەدەن.

ئامرازەکــە زۆر بەســەر ناوچــەکەدا بــەکار مەهێنــە، تــەنها ئەوەنــدە برێــك ناوچــەکە ڕووناك بێتەوە.




.6 ئـێـ ســتا بـچۆ بـۆ ســەر ناوچــە بریقەدارەکانی چاوەکە و ئامرازەکەی بەسـەردا بەکاربێنـە بـۆ گـەورەکردنی بریقەکان و زیاتر بریقەدارکردنیان.



.7 هەمـــــان کردارەکــــــانی هـــــەنگاوەکانی (5) و (6) بەسەر چاوەکەی تردا ئەنجام بدە. لە ئەنجامدا وێنەکەمان وەك خوارەوەی لێ دێت.



**بۆ بەراورد لەنێوان دوو وێنەکەدا تەماشای خوارەوە بکە.**

## کۆتایی

وەك دەزانین هەموو شتێك کۆتایی دێت، ئەم کتێبەش یەکێکە لەو شتانە. هیوادارام ئەم کتێبە سوودی گەیاندبێت بە تۆی خوێنەری خۆشەویست. لەگەڵ ئەوەی زانیاری ئامرازێکە کە دەکرێت بە شێوەیەکی سوودبەخش یان زیان بەخش بەکار بهێنرێت، بڵاوکردنەوە و بەخشینی زانیاری ئەرکی هەموومانە، چونکە ناکرێت شتێکی سوودبەخش بشارینەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی زیان بەخش بەکارنەیەت، ئەگەر ئەم کارە شتێکی باش بووایە ئەوا حکومەتەکان چەقۆیان قەدەغە دەکرد.

لەگەڵ ئەمەشدا، کەسانێك هەن بیروڕایان وایە تەنها خۆیان مافی زانینی شتیان هەیە، چونکە "خیبرە" یان هەیە و چەند ساڵێکە خەریکن، کاتێکیش تازە فێربوویەك دەبینن شتێکی تا ڕادەیەك باش ئەنجام دەدات (مەبەستم خۆم نییە، من کۆنەفێربووم، مەبەستم ئەو خوێنەرانەیە کە بەهۆی خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە یان هەر کتێبێکی ترەوە فێری زانیاری نوێ دەبن)، گاڵتەی پێ دەکەن و دەڵێن "توخوا سەیرکە کێ فێری شت بووە". ئەم کردارە وەك گاڵتەکردنە بە دەست وخەتی منداڵێك کە تازە فێری نووسین دەبێت. لەجیاتی پشتیگری کردن لە فێربوونی.

با بە خۆماندا بچینەوە و وازبێنین لە قۆرخ کردن (شاردنەوە) ی زانیاری. با وازیش بێنین لە دوورخستنەوەی کەسانی تر لە زانیاری تەنها لەبەر ئەوەی خۆمان شتەکە بزانین و خۆمان لەبەرچاویاندا بە گەورە پیشان بدەین.

گەورەیی تۆ لە هێزی جەستەیی و فیکریتدا نییە، بەڵکو لە گەورەیی و کراوەیی دڵتدایە. کەسێکی بەڕاستی زانا و لێهاتوو پێویستی بە ئافەرینی کەسانی تر نییە، خۆی دەزانێت کە زانایە و زانستی خۆی فێری هەموو ئەوانە دەکات کە زانستیان دەوێت. چونکە ئەم پێویستی بەوەیە نییە کە لەبەرچاو کەسانی تر خۆی بە گەورە پیشان بدات، کەسی زانا لە دڵی خۆیدا دەزانێت کەسێکی گەورەیە، ئەم هەستەش لە ئافەرینی هەزاران کەس بەنرخ ترە.

بەڵام، کەسانی نەزان پێویستیان بەوەیە کە تۆزێك شت بزانن، هەوڵیش دەدەن کە ئەم تۆزە زانستە بشارنەوە لە ترسی ئەوەی ڕۆژێك تۆ فێری بیت و ئەوان نەتوانن لە بەرچاوی تۆدا خۆیان بە گەورە پیشان بدەن، دەزانن کە ئەگەر زانست بڵاوبوویەوە کەس نابێت ئافەرینیان لێ بکات بۆ زانینی شتێك. کێشەکە لەوەدایە کە کەسانی بچووك پێویستیان بە ئافەرینی خەڵکی تر هەیە، چونکە خۆیان خۆیان بە کەس نازانن و بیرکردنەوەی خۆیان لەلا گرنگ نییە، تەنها گرنگی دەدەن بە بیرکردنەوەی کەسانی تر، "ئایا ئەو بە موهیمم دەزانێت؟ چی بکەم بۆ ئەوەی بە موهیمم بزانێت؟".

لێرەدا مەبەستم جیاکاری نییە لەنێوان کەسانی "گەورە" و کەسانی "بچووك". تەنها مەبەستم ئەوەیە بڵێم دەبێت زانست ببەخشین و نەترسین لە بڵاوبوونەوەی زانست. ئاخ بۆ ئەو ڕۆژەی خەڵکی لەمە تێدەگەن.

دەزانم دوای خوێندنەوەی ئەم دوو لاپەڕەیە لەوانەیە بڵێیت نووسینێکی باش بوو، پاشان بیر دەکەیتەوە "منیش شت فێری خەڵك دەکەم بەبێ شاردنەوەی زانیاری"، بەڵام دوای پێنج خولەك کوڕە تەمەن 15 ساڵەکەت دێتە ژوورەوە و دەڵێت "باوکە ئەوە چی دەخوێنیتەوە؟"، تۆش لەجیاتی ئەوەی بۆی ڕوون بکەیتەوە و زانستێکی پێ ببەخشیت، لەجیاتی ئەوەی هاندەری بیت بۆئەوەی ئەویش کتێبەکە بخوێنێتەوە و فێری شتێك بێت، دەڵێیت "کوڕم ئەوە ئیشی تۆ نییە." کەچی واشت دەزانی تۆ کەسێکی گەورەیت و بە دڵێکی کراوەوە زانست دەبەخشیت! ئەی ئەو کەسە چی لێ هات؟؟! ئەمە تەنها نموونەیەکە، ئەگەر بە ووردی بیر بکەیتەوە دەتوانیت هەموو ڕۆژێك سەدان نموونەی وەها ببیتیا لە بێبەشکردنی خەڵکی لە فێربوونی زانیاری.



به هیوای کرانەوەی دڵی تۆی ئازیز

و بەهیوای دروستبوونی هەستی بەخشینی زانیاری بەدڵێکی کراوەوە

براتان

إکرام هادی

14 ی نیسانی 2008